

# قەنارە

چەند تێڕامانێك دەربارەی
ملپەڕاندن

ئەلبێر کامۆ

وەرگێڕانی: ئەرسەلان ئەردەڵانی

[redacted]

# قەنارە

## چەند تیڕامانێك دەربارەی ملپەڕاندن


ئەلبێر کامۆ

وەرگێڕانی: ئەرسەلان ئەردەڵانی



چاپی یەکەم

٢٠١٥

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
زنجیرە( ٥٢٦ )

ناسنامەی کتێب

- ناوی کتێب: قەنارە
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- نوسینی: ئەلبیر کامۆ
- وەرگێڕانی: ئەرسەلان ئەردەڵانی
- بەرگ: جەمال جلال
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٥
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ناونیشان: سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف
ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە:
المقصلة، البير كامو
ترجمة: جورج طرابلشي
منشورات دار مكتبة الحياة – بيروت لبنان

بەراوردێك لەگەڵ ئەم سەرچاوە ئینگلیزیەشدا كراوە:
REFLECTIONS ON THE GUILLOTINE
TRANSLATED by: JUSTIN O'BRIEN
The Modern Library • New York

# پێشەکی

ملپەڕاندن مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی پێش زایین، ئەوکات لەرێگەی شمشێرو تەورەوە ئەم کارە ئەنجامدراوە، زۆر جاریش پرۆسەی ملپەڕاندنەکە دەرئەنجامەکەی بەو شێوە نەبووە کە چاوەڕوان دەکرا، بۆنموونە هەندێجار جەللادەکە هەڵەی دەکردو راستەوخۆ شمشێرەکە بەر گەردنی سزادراو نەدەکەوت، بەڵکو جاری وابوو بەر شانی یان روخساری دەکەوت. هیچ گەرەنتیەك نەبوو کە بتوانرێت بەیەکەم لێدان ملی سزادراو لەلاشەی بکرێتەوە، بۆیە هەندێجار جەللادەکە بەچەندین لێدان جا دەیتوانی مەرگی سزادراوەکە مسۆگەر بکات. دەوترێ جەللادەکان بۆئەوەی خۆیان لە هەڵە بپارێزن، واراهاتبوون دراوێکی ئاڵتونیان وەکو بەخشیش دەخستە دەستی سزادراوەوە، تاوەکو بتوانرێت بە لێدانێك یان دوو لێدان ملی لەلاشەی بکرێتەوە.

فەرەنسا لە سەدەی هەژدەهەمدا چەندین ئامرازی بەکاردەهێنا بۆ جێبەجێکردنی سزای لەسێدارەدان، دەرەبەگەکان بەشمشێر یاخود بە تەور سەریان لە لاشەیان دەکرایەوە، خەڵکی ئاساییش بە پەت لەسێدارە دەدران، ئەو کەسانەش کە بەتۆمەتی جادوگەریی یان بێباوەڕی یان لادانی سێکسی تۆمەتبار دەکران بەزیندویی دەسوتێنران، ئەوانەش کە پلانگێڕییان لەدژی پاشا دەگێڕا هەناویان دەردەهێنرا ئینجا دەکوژران. بەڵام لەدوای شۆڕشی فەرەنسی، کۆمەڵەی نیشتمانی لیژنەیەکی پێکهێنا بۆ دۆزینەوەو داهێنانی ئامرازێکی نوێی لەسێدارەدان کە تا رادەیەك مرۆییانەتر بێت لەو ئامرازانەی باسمانکرد، لیژنەکە کە بەسەرۆکایەتی دکتۆر (ئەنتوان لویس) پێکهاتبوو، توانیان شێوەیەکی سەرەتایی ئامێری ملپەڕاندن (Guillotine) دیزاین بکەن، هەڵبەتە سودیان لە دیزاینی ئامێرێکی ساکارتر وەرگرتبوو کە لەسەدەی سێزدەدا ئینگلیزەکان بەکاریان دەهێناو پێی دەوترا (Halifax).

ئەم ئامێرە نوێیە سەرەتا لەسەر ئاژەڵ و تەرمی مردوان تاقیکرایەوە، پاشان بۆیەکەم جار لەساڵی ١٧٩٢ـدا لەسەر چەتەیەك تاقیکرایەوە کە ناوی (نیکۆلاس بلیتای) بوو، لەپاشان بەیەکجاری بووە ئامرازی فەرمی فەرەنسا بۆ جێبەجێکردنی سزای لەسێدارەدان. بە تەنها

سەرۆکی کۆماریش دەیتوانی لە سزادراوانی قەنارە خۆش ببێت. ئەگەرچی ئامانج لەداهێنانی ئامێری ملپەڕاندن ئەوەبوو سزادراوان بەشێوازێکی مرۆیی و ئاسان بکوژرێن و خەڵکی رزگار بکرێن لەو ئامرازە داپڵۆسێنەرانەی دیکە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەکار دەهاتن، بەڵام ئەم ئامرازەش هیچی کەمتر نەبوو لەوانی تر، هێندەی ئەوان تۆقێنەرو سامناك بوو.

بەم ئامێرە هەزاران هەزار سەر لە لاشە کرایەوە، لەدیارترین ئەو سەرانەش سەری پاشای فەرەنسا لویسی شانزەیەم و شاژن ماری ئەنتوانێت بوو. ئەم ئامێرە سەردەمێکی زێڕینی بەخۆیەوە بینی، سەردەمێك کە ناونرا سەردەمی تۆقاندن ( REIGN OF TERROR)، لەم سەردەمەدا (رۆبسپییێر) کە بە خوێنڕێژەکەی شۆڕشی فەرەنسی ناسرابوو، لە ماوەی تەنها شەش هەفتەدا شەش هەزار کەسی ناردە بەردەم قەنارەو سەری سەرجەمیان لەلاشەیان کرایەوە. دواجار لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو لە کۆتایی ئەم سەردەمی تۆقاندنەدا (رۆبسپییێر) خۆیشی بە هەمان ئەو تۆمەتەی کە خۆی دەیخستە پاڵ ئەو کەسانەی ناردنی بۆ بەردەم قەنارە، بە تۆمەتی خیانەتکردن لە شۆڕش نێردرایە بەر ئەو ئامێرەو سەری لەلاشەی کرایەوە. ئەو کەسەش کە یەکێك بوو لە داهێنەرانی ئامێری

ملپەڕاندن و ناوی ئامێرەکەش بەناویەوە نرا دکتۆر جۆزێف گیوڵتن (DR. Guillotine) بوو، وەك باس دەکرێت خەریکبووە خودی دکتۆر گیوڵتنیش هەمان چارەنووسی بێت: لەو ماوەیەی کە ناونرابوو سەردەمی تۆقاندن، یەکێك لە لیژنەکانی شۆڕش کە لەژێر چاودێری ئەوکاتی رۆبسپییێر کاریان دەکرد، نامەی سزادراوێك دەدۆزنەوە کە بەرلە ملپەڕاندنی بۆ دکتۆر گیوڵتنی دەنووسێت و تێیدا داوای لێدەکات چاوی لە ژن و منداڵەکانیەوە بێت، کارێکی وەهاش لەو سەردەمەدا بە هاوسۆزی لەگەڵ دوژمنانی شۆڕش لەقەڵەم ئەدرا، بۆیە گیوڵتن دەگرن و دەستبەسەری دەکەن، بەڵام بەرلەوەی ببرێتە بەردەم قەنارە، رۆبسپییێر لەسێدارە دەدرێت و ئەمیش رزگاری دەبێت، دواجار دکتۆر گیوڵتن لەساڵی ١٨١٤ لەپاریس بەهۆکاری سروشتی دەمرێت.

یەکەمین هەوڵ بۆ لابردنی سزای ملپەڕاندن لە فەرەنسا لە ١٧٩١/٥/٣٠ـدا بوو، پرۆژە یاسایەك لەو بارەوە پێشکەش بە ئەنجومەنی نیشتمانی کرا، بەڵام لە ١٧٩١/١٠/٦ـدا پرۆژە یاساکە رەتکرایەوە. دواتر لە ساڵی ١٧٩٥ گۆنگرەی نیشتمانی هەستا بە لابردنی سزای ملپەڕاندن، بەڵام لەگەڵ ناپلیۆن بۆناپرت هاتە سەر حوکم ئەم سزایە گێڕدرایەوەو لە نێو یاسای گشتی ئیمپراتۆریەتی

فەرەنسیدا جێگیرکرا. چەندین هەوڵی جددی درا لەپێناو لابردنی سزای ملپەڕاندن کە ڕەنگە نەتوانرێت لە پێشەکیەکی وەها کورتدا ئاماژەیان پێبدرێت، سەرئەنجام فەرەنسا لەساڵی ١٩٨١ سزای ملپەڕاندنی هەڵوەشاندەوە، دوایین کەسیش کە بەم ئامێرە سەری لەلاشەی کرایەوە (حەمەد جەندوبی) تونسی بوو کە لەساڵی ١٩٧٧ بە تۆمەتی ئازاردان و کوشتنی هاوڕێ فەرەنسیەکەی لەسێدارە دەدرێت، دوایین جەڵلادی فەرەنساش کە سزای ملپەڕاندنی جێبەجێ دەکرد (مارسێل شۆفالێ) بوو.

ئەم وتارە درێژەی کامۆش یەکێکە لە هەوڵە هەرە ئازاو بوێرەکان لەپێناو لابردنی ئەم سزایە، لەم وتارەیدا بە وردی شەنوکەوی پرسی سزای ملپەڕاندن دەکات بەسەرجەم لایەنەکانیەوە، دەست دەخاتە سەر ئەو برینە قوڵانەی کە ئەم سزایە لەنێو کۆمەڵگەدا دروستی دەکات، کاریگەریە نەرێنیەکانی لەسەر لایەنە هەستیی و جەستەییەکانی کەسی سزادراو نیشان ئەدات، قێزەونی ئەم ئامرازەمان پێدەناسێنێ کە بەدەرە لە هەموو ئاکارێکی مرۆیی، هاوکات ئەوەش ڕووندەکاتەوە کە ئەم سزایە ناتوانێت هۆکارێك بێت بۆ کەمبوونەوەی تاوان. کامۆ ئەم نامیلکەی لەساڵی ١٩٥٧ نووسی، پاش ئەوەی (ئارسەر کۆستلەر) لە ساڵی ١٩٥٥ لە ئینگلترا

هەڵمەتێکی رۆژنامەوانی لەدژی سزای لەسێدارەدان لەو وڵاتە بەرپاکرد.

ئەرسەلان ئەردەڵانی

کەمێك پێش جەنگی ١٩١٤، لە جەزائیر سزای ملپەڕاندن بەسەر بکوژێکدا سەپێنرا کە تاوانێکی ئەنجامدابوو بەراستی شایەنی سەرکۆنەکردنە (خێزانێکی جوتیاری بە پیرو منداڵەوە سەربڕیبوو). بکوژەکە کرێکارێکی کشتکار بوو، لەژێر فشاری جۆرێك لە خوێن هەڵچووندا ئەم تاوانەی ئەنجامدابوو، ئەوەی هێندەیتر تاوانەکەی مەترسیدارتر کردبوو ئەوەبوو کە کوژراوەکانیشی رفاندبوو. ئەم دۆسیەش دەنگۆو هەرایەکی گەورەی نایەوە. خەڵکی لەو باوەڕەدابوون کە سزای سەربڕین بۆ ئەم دڕندەیە سزایەکی سوکە. وەك بۆیان باسکردم باوکیشم لەو بارەیەوە هەمان بۆچوونی هەبووە، بەتایبەت لەداخی کوشتنی منداڵەکانی ئەو خێزانە. یەکێك لەو شتە سەیرانەش کە لەبارەی باوکمەوە دەیزانم ئەوەیە کە ئەو جارە یەکەم جار بووە لە ژیانیدا ویستویەتی ئامادەبێت لەکاتی جێبەجێکردنی سزای لەسێدارەدان. بەو شەوە هەستابوو رۆشتبوو بۆ شوێنی جێبەجێکردنی سزاکەو لەگەڵ جەماوەرێکی زۆردا وەستابوو. بەڵام

هەرچیەکی دیبوو بۆ کەسی نەگێڕابووەوە. دایکم باسی دەکات و دەڵێت ئەو بەیانیە وەك گەردەلول خۆی کرد بەژوردا، روخساری گرژبوو قسەی نەدەکرد، تا ماوەیەك لەسەر پێخەفەکە راکشا پاشان لەناکاو رشایەوە. دیاربوو ئەو راستیانەی بۆ دەرکەوتبوو کە لەژێر دارشتە گەورەکاندا شاراونەتەوە. چونکە ئەمجارە لەبری بیرکردنەوە لە منداڵە سەربڕاوەکان بیری لە لەشی شێواوی تاوانبارەکە دەکردەوە کەچۆن خراوەتە سەر تەختێك و ملی لە لاشەی کراوەتەوە.

ئیتر دەبێت بزانین کە ئەم کارە نەریتگەرایە کارێکی زۆر نەشیاوە کەوا توانیویەتی توڕەیی پیاوێکی ساکار و سەرڕاست لەناوبەرێت، ئەو کە یەکەم جار پێیوابوو ئەو بکوژە سەد جار شایەنی ئەو سزایە، ئێستاکە بەبینینی جۆری سزاکە دەرشێتەوە.

کاتێك توندترین سزا پاڵ بە پیاوچاکێکەوە دەنێ برشێتەوە، ئیدی بەئاستەم دەتوانین گریمانەی ئەوە بکەین کە ئامانجی ئەم کارە دابینکردنی ئاسایش و سیستەمە بۆ کۆمەڵگە. بەپێچەوانەوە ئەم سزایە هیچی کەمتر نییە لە تاوانە دڕندانەکەی کابرا، ئەم تاوانە نوێیە لەبری ئەوەی ئەو سوکایەتیە بسڕێتەوە کە بەسەر دامەزراوەی کۆمەڵایەتیدا هێنراوە، هێندەیتر تاوانی یەکەم قێزەونتر دەکات. هیچ کەسێکیش

ناوێریٚ راستەوخۆ لەبارەی ئەم راستیەوە قسە بکات. ئەو کاربەدەستو رۆژنامەنووسانەشی راسپێردراون بە قسەکردن لەسەر ئەم دۆخانە بە زمانێکی نەریتگەراوە قسەی لەسەر دەکەن، وەکو وابێ بزانن کە لەیەك کاتدا مایەی سەرنج و شەرمەزاریشە، قسەکانیان لەچەند رستەیەکی کۆتو بەندکراو تێناپەڕێ.

بەمشێوە، لەئان وساتی نانی بەیانیاندا، لە یەکێك لە گۆشەکانی رۆژنامەیەکدا دەخوێنینەوە: (سزادراو ئەو قەرزەی لەئەستۆی بوو دایەوە بە کۆمەڵگا)، یان دەبینین نووسراوە: (کاژێر پێنج، داد هەقی خۆی وەرگرتەوە). لێرەو لەوێ کارمەندانیش بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ باسی سزادراو دەکەن، هەڵبەتە بەناوی خۆیشی ناوی نابەن بەڵکو هەندێ جار بەکورتکراوی ئاماژە بە ناوی دەکەن وەك: (م.ب.ع). ئەوان بەدەنگێکی نزم "ئەگەر راستبێ بلێم" لەبارەی توندترین سزاوە[1] دەنووسن. ئێمەش لەم کۆمەڵگە شارستانیە پێشکەوتووەماندا دەزانین کە نەخۆشیەکە مەترسیدارە کاتێ ناوێرین راستەوخۆ قسەی لەبارەوە بکەین. خانەوادە بۆرژواکان تا ماوەیەکی درێژیش کاتێ کە باسی نەخۆشیە خراپەکانیان دەکرد دەیانگووت سینگی کچە بچکۆلانەکە لاوازبووە، یان دەیانگووت باوکەکەیان

---

(1) مەبەست لە توندترین سزا سزای لەسێدارەدانە.

تووشی (وەرەم) بووە، چونکە ئەوکات نەخۆشیەکانی وەك سیلو شێرپەنجە نەخۆشیگەلێکی تا رادەیەك شەرمەندە بوون. ئەم نموونەیە زۆر بەم چەشنە سزای لەسیدارەدانە دەشێت، ئەوەتا هەموان تەنها بە نووسین قسەی لەبارەوە دەکەن. ئەم سزایە بۆ کۆمەڵگا وەك شێرپەنجە وایە بۆ تاك، تەنها جیاوازییەك ئەوەیە کە تا ئێستا هیچ کەس باسی پێویستی شێرپەنجەی نەکردوە. ئەوان بەچەشنی سزای ملپەڕاندن نالێن پێویستییەکی جێی داخە، نالێن چونکە جێی داخە باشترە قسەی لەسەر نەکەین.

بەڵام من بە پێچەوانەوە دەمەوێت بەوپەڕی دەم کراوەییەوە قسەی لەسەرکەم، نەك لەبەر ئەوەی من حەزم لە ئابڕوچوونە، پێموایە لەبەر ئەوەش نییە کە حەزم لە لادان بێت. من هەمیشە وەك نووسەرێك قێزم لە هەندێ ئاسانکاری دەکردەوە، وەك مرۆڤێکیش پێموایە دیمەنە قێزەونەکانی ئەم دۆخەمان ئەگەر بڕاوەبێت ئەوا دەبێ بەبێدەنگی رووبەرووی بینەوە. بەڵام کاتێك بێدەنگی یاخود فێڵە زمانەوانیەکان بەشدار دەبن لە قۆرخکردنی دۆخەکە، ئەوکات دەبێ دۆخەکە راست بکرێتەوە، چونکە هیچ چارەیەکی تر نییە جگە لەوەی دەبێ بە روونی قسەبکەینو ئەو نەنگیانە دەرخەین کە لەژێر پاڵتۆی وشەکاندا خۆیان شاردۆتەوە.

فەرەنسا هاوتا لەگەڵ ئیسپانیاو ئینگلترا یەکێکی ترە لەو وڵاتانەی کە لەمدیوی ئەم پەردە ئاسنینەوە شەرەفی ئەوەیان هەیە کە تائێستاش سزای لەسێدارەدانیان لەنێو بوخچەی ئامرازەکانی داپلۆساندندا هێشتۆتەوە. ئەم نەریتە سەرەتاییە لەنێوماندا نەدەمایەوە ئەگەر بێباکی و نەزانی رای گشتی نەبوایە، ئەو رای گشتیەی کە تەنها بە رستەی ئاهەنگسازییەوە گوزارشت لە رای خۆی دەکات. وشەکان لە ماناکانیان پووچەڵ دەبنەوە کاتێك خەیاڵ دەنوێت. گەلێکی نابیستە، بێباکانە تۆمەتبارکردنی مرۆڤەکان تۆمار دەکات. بەڵام ئەگەر ئامێرێکمان داهێناو وامان لێکرد دەست لە تەختەو ئاسان بداتو دەنگی کەوتنی ئەو سەرەی لەلاشەکەی دەبێتەوە بکەوێتە بەرگوێی، ئەودەم کە خەیاڵی جەماوەریی لەناکاو لەخەو ڕادێت، لەیەك کاتدا هەموو ئەو دەستەواژانە سەرکۆنە دەکات.

کاتێك نازیەکان لە پۆلۆنیا دیلەکانیان بە کۆمەڵ دەکوشت، بۆئەوەی ڕێبگرن لەوەی دیلەکان هوتافی ئازادی و یاخیبوون بکێشن، دەمی هەموویانیان دەبەست. ناشتوانین بێئابڕویانە چارەنووسی ئەو قوربانیە بێتاوانانە بچوێنین بە چارەنووسی تاوانبارە سزادراوەکان. سەرباری ئەوەی لە وڵاتی ئێمە تەنها تاوانباران نین کە بە قەنارە لەسێدارە دەدرێن بەڵام ڕێگاکە هەمان ڕێگایە. ئێمە لەژێر چەند دروشمێکی

سەرکوتکراودا وشەکان دەخنکێنین کە تا بەوردی تەماشای نەکەین ناتوانین ڕەوابوونی دووپاتبکەینەوە. ئیدی لەبری ئەوەی بڵێین سزای لەسێدارەدان پێویستەو، واباشترە قسەی لەبارەوە نەکەین، پێویستە لەسەرمان بەپێچەوانەوە بدوێین و بڵێین: ئایا دەبێ بە پێویستی بزانین وەك ئەوەی ئێستا هەیە؟..

سزای لەسێدارەدان بەلای منەوە نەك هەر بێهودەیە بەڵکو پێموایە زۆریش زیانبەخشە، لێرەدا پێویستە ئەم بۆچوونەی خۆم تۆمارکەم بەرلەوەی بچمە نێو کرۆکی بابەتەکەوە. ڕەوا نییە گەر بڵێم لەپاش چەند هەفتەیەك لە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون بۆ ئەم پرسە گەشتومەتە ئەم ئەنجامە. هاوکات بە ڕەواشی نابینم گەر بڵێم ئەم بۆچوونەم تەنها دەرهاوێشتەی سۆزە. من زۆر دورم لەو نەرمونیانیەی کە دەبێتەهۆی تێکەڵبوونی بەهاو بەرپرسیاریەتیەکانو یەکسانبوونی تاوانەکان، نەرمیەك کە بەهۆیەوە بێتاوانی بەیەکجاری مافەکانی لەدەست دەدات. من بە پێچەوانەی چەندین ناوداری هاوچەرخەوە، پێموانییە مرۆڤ ئاژەڵێکی کۆمەڵایەتیە. لە ڕاستیدا من پێموایە پێچەوانەیە، پێموایە چیتر ناتوانێت لەدەرەوەی ئەو کۆمەڵگایە بژی کە چیدی یاساکانی بوونەتە پێویست لەپێناو مانەوەی. کەواتە دەبێ بەرپرسیاریەتیەکان بەپێی دابەشکارییەکی ماقوڵو سەرکەوتوانەو

لەلایەن خودی کۆمەڵگاوە بڕیاری لەسەر بدرێت. من بەدرێژایی چەند ساڵ تێڕامان نەمتوانیوە شتێك لە سزای مەرگدا ببینمەوە ئازار نەبێت، ئازارێکی تیا دەبینمەوە کە مێشکم بەرگەی ناگرێت، پشێویەکی تیا دەبینمەوە کە ئەقڵم سەرکۆنەی دەکات. هەڵبەتە من ئامادەبووم باوەڕبێنم بەوەی کە خەیاڵ کاریگەری دەبێت لە بڕیاردانم لەسەر ئەم پرسە، بەڵام لە راستیدا لەماوەی ئەم دوو هەفتەیەدا هیچ شتێکم نەدۆزییەوە ئەو باوەڕم پشتئەستور بکات یان بیرکردنەوەکانم بگۆڕێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە چەندین بەهانەی تر سەرباری بەهانەکانی دیکەم بوون. من ئێستا بەتەواوی هاوڕام لەگەڵ (کۆستلەر) کە دەڵێ: "سزای مەرگ کۆمەڵگەکەمان پیس و چەپەڵ دەکات، لایەنگرانی ئەم سزایەش ناتوانن بەشێوەیەکی لۆژیکیانە بەهانەداری بکەن".

دیارە گەورەترین بیانوی لایەنگرای سزای مەرگ ئەوەیە کە خەڵکانی دی تەمێ وەرگرن. چونکە سەرەکان بۆ ئەوە لە لاشە ناکرێنەوەکە تەنها سزای سزادراوانی پێبدرێ، بەڵکو بۆ ئەوەشە کە لەڕێی نمونەیەکی وەها تۆقێنەرەوە خەڵکانی تریشی پێ بترسێنرێت تاوەکو ئەزمونەکانی ئەوان دوبارە نەکەنەوە. کۆمەڵگا تۆڵە ناسەنێتەوە بەڵکو تەنها خۆی خاوێن دەکاتەوەو خۆی دەپارێزێت. کۆمەڵگا سەر

بڕدراوەکان بەرزدەکاتەوە تاوەکو تاوانکاران ئایندەی خۆیانی لێوە ببینن، ئیدی سڵ لە تاوان بکەنەوەو پاشگەزببنەوە.

ڕەنگە ئەم بیانوە کاریگەری هەبوایە گەر ناچار نەبوینایە بەتێبینیکردنی ئەم خاڵانە:

١. کۆمەڵگا خۆی باوەڕی بەو (پەند وەرگرتن)ـە نییە کە باسی دەکات.

٢. تا ئێستا نەسەلمێندراوە کە سزای مەرگ تاکە بکوژێکی لە کوشتن گێڕابێتەوە، ئاشکرایشە کە چیدی ئەم سزایە هیچ کاریگەری و سلەمینەوەی بۆسەر ئەوان نەماوە، ڕەنگیشە بلێم بووەتە مایەی چێژبەخشین بەوان.

٣. لەلایەکی دیکەشەوە ئەم سزایە بووەتە نمونەیەکی بێزراو کە هیچ کەس نازانێت دەرئەنجامەکانی چی دەبن.

لە ڕاستیدا پێشی هەموو شتێك کۆمەڵگە خۆی باوەڕی بەو شتانە نییە کە دەیانلێت. وەگەر بە ڕاستی باوەڕی بە قسەکانی خۆی هەبوایە دەبا جێبەجێکردنی ئەو سزایانەی بە کەمپینێکی گەورەی پڕوپاگەندەوە ئەنجام دابا، وەك ئەو کەمپینانەی کە بۆ قەرزی نیشتمانی و جۆرە تازەکانی مەی تەرخانی دەکات. بەڵام ئێمە دەزانین کە بەپێچەوانەوە، چیدی لە وڵاتی ئێمە جێبەجێکردنی ئەم سزایە

بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەنجام نادرێت، بەڵکو ئێستا لە گۆڕەپانی بەندیخانەکاندا و لەپێش چاوی ژمارەیەکی کەم لە خەڵکانی پسپۆڕ ئەنجام ئەدرێت، کەسانێکی کەمیش لێی ئاگادار دەبن و بەکاتەکەی دەزانن. ئەم ڕێوشوێنە تا رادەیەك نوێیە. چونکە دوایین جێبەجێکردنی سزای ملپەڕاندن بەشێوەیەکی ئاشکرا لەساڵی ١٩٣٩ دا بوو، ئەوجارە (ویدمان)ـیان لەسێدارەدا کە چەند تاوانێکی ئەنجامدابوو، بەشێوازێکی هێند بوێرانەبوو کە پاشتر ناوبانگی وەرگرت.

ئەو بەیانیەی کە بڕیاربوو (ویدمان) لەسێدارە بدرێ، جەماوەرێکی زۆر لە ڤێرسای کۆبوونەوە، ژمارەیەکی زۆر وێنەگریشیان تێدابوو. لەو کاتەی کە (ویدمان) لەپێش چاوی جەماوەردا سەری لە لاشەی کرایەوە، توانرا چەند وێنەیەکی بگیرێت. پاش چەند کاژێرێك، رۆژنامەی (پاریس – سوار) لاپەڕەیەکی پڕ وێنەی لەسەر ئەو رووداوە (کە ئیشتیهای خواردنت دەکاتەوە) بڵاوکردەوە. بەمشێوە دانیشتوانی بەرێزی پاریس توانیان تێبینی ئەوەبکەن کە ئەو ئامێرە تیژەی جێبەجێکاری سزاکە بەکاری هێنا، جیاوازە لە قەنارەی مێژوویی، هێندەی جیاوازی ئۆتۆمبێلێکی نوێی جاگوار لە ئۆتۆمبێلە کۆنەکانی وەك: (دیۆن – بوتۆن).

ئیدی ئەوەبوو بە پێچەوانەی ئەوەی چاوەڕوان دەکرا، حکومەت بە چاوێکی زۆر توڕەوە تەماشای دۆخەکەی کرد، رایشیگەیاند کە رۆژنامەکان ویستویانە ئارەزووی خوێنەرە سادیستەکانیان تێر کەن. بەمشێوە بڕیاردرا کە چیتر سزای ملپەڕاندن بەشێوەیەکی ئاشکرا جێبەجێ نەکرێت، گرتنەبەری رێوشوێنێکی وەهاش تا رادەیەك بۆ دەسەڵاتە داگیرکەرەکان ئاسان بوو.

لەم دۆسیەدا لۆژیك پاڵپشتی دارێژەرانی یاسادا نەبوو. چونکە بەپێچەوانەوە، دەبوایە خەڵاتێکی نوێ بە بەرێوبەری رۆژنامەی (پاریس – سوار) بدرابا تاوەکو هانی بدەن بۆئەوەی لە ئایندەدا کاری باشتر بکات. لە راستیدا ئەگەر بمانەوێ خەڵك پەند لە سزادانی کەسانی دی وەرگرێت نابێت تەنها وێنەی زۆرتری ئەو سزایانە بگرین بەڵکو دەبێ کاژێر دووی پاشنیوەڕۆ قەنارەیەکیش لە گۆڕەپانی (کۆنکۆرد) هەڵبەستین، هەموو خەڵکیش بانگهێشت بکەین‌و پەخشی ئاهەنگی ملپەڕاندنەکەش لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆنەوە بگوازینەوە بۆ ئەوانەی کە ئامادە نین لە گۆڕەپانەکە. یان دەبێ وەها بکەین، یان دەبێ چیتر باسی عیبرەت نەکەین. چۆن دەکرێ تاوانێکی کوشتن بەنهێنی لەشەوداو لە گۆڕەپانی بەندیخانەیەکدا، ببێتە عیبرەت؟ لە راستیدا ئەوەی لەئارادایە ئەوەیە ئەوان بەم جۆرە کارانە، بەسەرە هاوڵاتیان

ئاگاداردەکەنەوە لەوەی ئەگەر هاتوو خەڵکیان کوشت ئەوا بەمشێوە دەمرن. ئەمە دەکرێ ئایندەی کەسانێکی دیکەش بێ کە کوشتنیان ئەنجام نەداوە. وەگەر بمانەوێ سزا ببێتە عیبرەت دەبێ سامناك بێت. لە راستیدا (تیۆ دی لابوڤوری) کە لە ساڵی ١٧٩١ نوێنەر گەل بوو، هاوکات لایەنگری جێبەجێکردنی ئاشکرای سزای ملپەڕاندن بوو، زۆر لۆژیکی بوو کاتێ کە لە کۆمکاری نیشتمانی جاڕیدا و وتی: "پێویستمان بە دیمەنێکی ترسناك هەیە بۆ تۆقاندنی گەل".

ئەمڕۆکە لەم شێوە دیمەنانە بوونیان نییە، سزادانێك لە ئارادایە کە خەڵکی تەنها لە رێگەی بیستنەوە دەیزانن. جارجارێکیش تاوانباری داهاتوو، لەساتی ئەنجامدانی تاوانەکەیدا، بەسزادانی، کۆمەڵگا هێندەی تر ماندو دەکات لەوەی کەمی بکاتەوە. ئەگەر بە راستی دەمانەوێت ئەم سزایە هەمیشە لەیادی کۆمەڵگەدا بێت، ئایا نابێت هەوڵبدەین شێوەی راستەقینەیی ئەم سزایە، بە هەموو وێنەو ئامرازو زمانێك، لە قوڵایی هەموو هەستەوەرەکاندا بچەسپێنین؟

ئایا لەبری ئەوەی بە پەنهانییەوە باسی ئەوە بکەین کە ئەم بەیانیە کەسێك قەرزەکەی خۆی بە کۆمەڵگە دایەوە! باشتر نابێتە عیبرەت گەر سود لەم بۆنە خۆشە وەرگرین و خۆمان ئامادە بین لە شوێنی جێبەجێکردنی سزاکەو هەموو وردەکاریەکان بەچاوی خۆمان ببینین؟

ئیدی لەبری ئەوەی بوترێ: "ئەگەر کەسێکت کوشت، لەقەنارە ئەدرێیت" باشتر نییە بەو پەڕی پەندوەرگرتنەوە بوترێ: " ئەگەر کەسێکت کوشت، بۆ ماوەی چەندین مانگو ساڵ دەخرێیتە زیندانەوە، بەردەوام هاودەمی نائومێدو سامناکی دەبیت، تا رۆژێك دەمەوبەیان دێینە زیندانەکەتەوە، بە پێخاوسی دێین تاوەکو گوێت لە دەنگی پێمان نەبێت‌و سوپرایەزەکەمان بەهێزتر بێت کاتێ لەپڕ لەپاش شڵەژاویی‌و شەونخونی شەو لەخەو هەڵتدەستێنین. هەڵدەکوتینە سەرت‌و هەردوو مەچەکت لەپشتەوە دەبەستینەوە، ئەگەر پێویست بکات بە مقەست قژت دەبڕین‌و یەخەی کراسەکەت هەڵدەدڕین. بۆ باشتر جلەوکردنی دۆخەکە، بە پشتوێنێکی چەرم هەردوو قۆڵت دەبەستین، تاوەکو بەناچاری کووڕ بیتەوەو دەرئەنجام ملت وەك پێویست بێتە پێش. پاشان هەڵتەگرین، دوو پیاو باڵەکانت رادەکێشن، قاچەکانیشت بەنێو ڕاڕەوەکەدا خاکێش دەبن. دواجار، لەژێر ئاسمانێکی شادوماندا، یەکێك لە جەللادەکان بە پانتۆڵەکەت هەڵتدەگرێت‌و فڕێتدەداتە سەر پلێتێکی تەختە، ئەوی دیکەشیان سەرت لەنێو کونی سەر پلێتەکە جێگیر دەکات، جەللادی سێهەمیش

لە بەرزی دوو مەترو بیست سانتیمەوە کاردێکی[*] شەست کیلۆیی بەردەداتەوەو وەك گوێزانی ریش تاشین ملت دەپەڕێنێ".

هەروەها بۆئەوەی پەندوەرگرتنەکە بەسودتر بێت، بۆئەوەی لە دەرئەنجامی ئەو ترسەی کە لەناخی هەر یەك لە ئێمەدا هێزێکی کوێرانەو بەزێن دروست دەکات، ببێتە هێزێك کە بتوانرێ لە کاتی پێویستدا جێگەی ئارەزووی کوشتنی پێ بگیرێتەوە، دەبێ دورتر برۆین. جا لەبری ئەوەی بەو هەڵەشەییو جرپەجرپەی کە پێوەی ناسراوین، شانازی بەوەوە بکەین کە توانیومانە ئامرازێکی وەها خێراو مرۆییمان بۆ کوشتنی سزادراوان دروستکردوە[1]، پێویستە بەهەزاران کۆپی لەو راپۆرتە پزیشکیانە بڵاوبکەینەوە کە باس دوخی لەشی پاش ملپەڕاندن دەکات، دەبێ ئەو راپۆرتانە لە خوێندنگەو کۆلێژەکانماندا بخوێنرێن. ئامۆژگاری دەکەم کە راپۆرتێکی نوێی ئاکادیمیای پزیشکی، کە لەلایەن هەردوو دکتۆر (بنیدۆلیڤەر) و (فۆرنێ)ـوە ئامادەکراوە، چاپ و بڵاو بکرێتەوە. ئەم دوو پزیشکە ئازایە کە داوایان لێکراوە لە پێناو بەرژەوەندی گشتیدا لەشی لەسێدارەدراوان بپشکنن، لە

(*) کارد: کێرد، چزلك، چەقۆیەکی گەورەیە کە بەشێکە لە ئامێری قەنارەو سەری سزادراوی پێ دەپەڕێنرێت. (وەرگێڕی کوردی)

(1) دکتۆر گیوتانی گەشبین پێیوایە کە سزادراو لەو کاتەدا هەست بە هیچ ناکات، تەنها تەزویەکی سارد بەسەر ملیدا دێ. (تێبینی: قەنارە لە زمانی فەرەنسیدا پێی دەوترێ گیوتین).

کۆنوسێکدا تێبینیە ساماناکەکانیان پوختکردۆتەوەو دەڵێن: "ئەگەر ڕێگە بە خۆمان بدەین بۆچوونی خۆمان لەمبارەیەوە بدەین، ئەوا دەڵێین ئەم دیمەنانە زۆر ئازاربەخشن. هەرچی خوێنی خوێنبەرەکان هەیە بەگوژم لە ڕەگی لاملیانەوە دێتەدەر، پاشان خەست دەبێتەوە. ماسولکەکان کرژدەبن‌و ریشاڵەکانی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دێنەوەیەك. ڕیخۆڵەکان پێچدەخۆن، دڵیش بە چەشنێکی شپرزو نا ڕێکخراو لێدەدات. دەمیشی لەچەند ساتێکدا دێتەوە یەك... ڕاستە چاوەکانی کراوەن‌و نابزوێن، بەڵام خۆشبەختانە نادیدەن، گەرچی وەك چاوی مردوان سپی نەبووە، بەڵام چیدی لەجولە کەوتوون، لە ڕوونیدا زیندون، کەچی بێگیانن.. هەموو ئەمانە ڕەنگە چەند خولەکێك بخایەنێت، ڕەنگە چەند کاژێرێکیشی پێ بچێت. بەلای ئەندامەکانی لاشەوە مەرگ دەستبەجێ ڕوونادات، واتە بۆ مەرگێکی ئاسایی هێدی هێدی ئەندامەکان لەکاردەکەون بەڵام بۆ مەرگێکی خێرای لەمجۆرە هەموو تۆخمێکی زیندووی لەشی ئەو مرۆڤە لەپاش سەربڕینی بە زیندوویی دەمێنێتەوە. سەرئەنجام پزیشکیش هیچی بۆ نامێنێتەوە جگە لە ئەزموونێکی ترسناك لەبارەی پرۆسەیەکی شیکاری کۆشندەوە، کە دواتر ناشتنێکی پێشوەختی بەدوادا دێ"[2].

---

[2] گۆڤاری (دادپەروەری بەبێ جەللاد)، ژمارە دوو، حوزەیرانی ١٩٥٦.

پێموایە زۆربەی ئەو خوێنەرانەی ئەم راپۆرتە سامناکە دەخوێننەوە رەنگیان دەبزرکێ. کەواتە دەتوانرێ پشتی پێبەستری بۆ پەندوەرگرتن‌و ترساندن. جگەلەوەش دەتوانین راپۆرت‌و لێدوانی شایەتحالانیشی بۆ سەربارکەین کە ئەوانیش راستیی تێبینیەکانی دوو پزیشکەکە دەسەلمێنن. بۆنمونە دەوترێ: روخساری (شارلۆت کۆردای)[3] پاش ملپەڕاندنی سورهەلگەڕاوە. سەرسامیش نابین کاتێ گوێمان لەشتی تازەتر دەبێ، ئەوەتا یاریدەری جەللادێك باس لە دیمەنێکی ملپەڕاندن دەکات‌و دەلێ: "ئەو کەسەی کە خستمانە بەر قەنارەکە شێتێکی راستەقینە بوو. وەختێ سەریمان لە لاشەی کردەوە دەستبەجێ سەری بێگیان کەوت، بەلام جەستەی بە تەواوی مانا هەلسایەوە، لەنێو تۆرکەدا دەستی بە پەتەکانەوە گرت. پاش بیست خولەك، لەنێو گۆڕستانەکەدا، هێشتا دەلەرزی"[4]. قەشە (دیڤۆیور) کە ئێستا رێبەرە لە بەندیخانەی (لاسانتێ)، کە وادیارە رێگر نییە لەسزای مەرگ، ئەم چیرۆکە دور مەبەستە لە پەرتوکی (هەلەکاران)ـدا دەگێڕێتەوە، کە باس لە چیرۆکی سزادراو (لانگێل)

---

(3) کچێکی فەرەنسییە، پاش ئەوەی لە شۆڕشی فەرەنسیدا (مارا)ـی سیاسەتمەداری تیرۆرکرد، لەسێدارەدرا.

(4) (رۆجێ گارونی) لە کتێبی (وەحشەکان)ـدا باسی کردوە. لە بلاوکراوەی خانەی گالیمارە. ئەو قسانەشی بە تەواوی راستن.

دەکات کە گوایە سەرە بڕاوەکەی لەکاتی ناوهێنانیدا دەهاتەگۆ، دەڵێت: "سزادراو لە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژەی کە دەبوو لەسێدارە بدرێ بێتاقەت‌و توڕەبوو، نەیهێشت دادرەسی ئاینیانەی بۆ بکرێت. ئێمە دەمانزانی کە ژنەکەیی زۆر خۆشدەوێت، هەڵبەت ژنەکەشی خواپەرست‌و مەسیحییەکی لەڕادەبەدەر بوو، بۆیە پێمانووت: دەی لەبەر خۆشەویستیت بۆ ژنەکەت، بەر لە مەرگ کەمێك لە خوا بپاڕێرەوە. ئەمجارەیان سزادراو بەگوێی کردین‌و لەبەردەم خاچدا بە تەواوی ملی کەچکرد، پاشان وادەردەکەوت کە چیدی تەنانەت هەست بە بوونی ئێمەش ناکات لەو شوێنە. کاتێکیش سزاکەی بەسەردا جێبەجێکرا، ئێمە لە نزیکیەوە وەستابووین. سەری کەوتە ناو ئەو بەرچنەی کە لە بەردەم قەنارەکەدا دانرابوو، هێندەی نەخایاند جەستەیان خستە نێو قوڵینەوە. جیاواز لە جاران، قوڵینەکە سەرقەپاتکرا بێ ئەوەی سەری سزادراویشی تێخەن. ئەو یاریدەرەشی کە سەرەکەی هەڵگرتبوو ناچاربوو ساتێك ڕاوەستێ هەتا سەرلەنوێ قوڵینەکە بکەنەوە. ڕاستیەکەی لەو ماوە کەمەدا توانیمان چاوانی سزادراو ببینین کە وادیاربوو بەنیگایەکی پڕ لە پاڕانەوەوە تەماشای من دەکەن، وەکو وابێت داوای بەخشین دەکەن. ئەوەبوو ئێمەش بۆ پیرۆزکردنی سەرەکە خاچێکمان نواند، پاش ئەمە سزادراو چاوی

تروکاند، ئینجا چاوەکانی گوزارشتیان لە خامۆشبوون دەکرد، دواجار نیگاکە کوژایەوە ئەگەرچی هەر دەربڕینیان تیامابوو"؟ خوێنەر ئازادە لەوەی تاچەند باوەڕ بەم شیکاریەی قەشەکە دەکات. هەرچەندە گومان لەوەدا نییە کە ئەو چاوانەی کە "هەر دەربڕینیان تیامابوو" پێویستیان بە شیکردنەوە نییە.

دەتوانم چەندین راپۆرتو نووسینی تر بخەمەروو کە هیچیان هەڵێتوپەڵیتی کەمتریان تیا نییە. بەڵام دەبێ لەوە دورتر بڕۆم. من لەپاش هەموو شتێك، ناتوانم بڵێم سزای مەرگ خەڵك عیبرەتی لێوەردەگرێ، بەلای منەوە ئەم سزایە نەشتەرگەرییەکی قورسەو لە هەلومەرجێکی ناهەمواردا ئەنجام ئەدرێت کە بێبەشە لە هەلومەرجەکانی عیبرەتدان. دەوڵەتو کۆمەڵگاش دەتوانن بەرگەی ئەم وردکاریانە بگرن، چونکە باسی پەندوەرگرتن دەکەن ناچارن بوار بەخەڵکی بدەن ئەوانیش بەرگەی بگرن، تاوەکو کەسێك نەمێنێ بێئاگابێ لێی، بۆئەوەی خەڵك لە ترسا لە شەڕەنگێزی دورکەونەوە. بەبێ ئەم رێگایەش، ئەوانەی کە هیواخوازن لەسێدارەدانی شاراوە ببێتە عیبرەت، یان پێیانوایە وەك خۆیان دەڵێن: بەسزایەکی خێراو هەستپێنەکراو، بە ئازارێکی رازاوە بە گوڵی رەوانبێژی خەڵك پەندوەردەگرن! بەدڵنیاییەوە دەڵێم ئەوان بەم کارە ئەو کەسانەیان پێ

ناترسێنرێت کە سەرڕاستن (کە بە راستی هەندێکیان سەرڕاستن)، چونکە ئەوان لەو دەمو ساتەی سزاکە جێبەجێ دەکرێ خەوتوون، چونکە ئەوان ئاگادار نەکراونەتەوە لەم پەندوەرگرتنە گەورە، ئیدی ئەوان لەو دەمەی کە ناشتنی پێشوەخت ئەنجام ئەدرێت سەرقاڵی خواردنی نانی بەیانیانن. دواتریش ئەگەر بێتو رۆژنامە بخوێننەوە، رونکردنەوەیەکی شیرینو هەڵبەستراو لەو بارەوە دەخوێننەوە کە یەکسەر وەك شەکر لە یادگاریاندا دەتوێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم بوونەوەرە روخۆشو لەسەرخۆیانەش زۆرترین رێژەی تاوانی کوشتن ئەنجام دەدەن. زۆرێك لەو خەڵکە بەشەرەفەش تاوانبارنو نازانن بە خۆیان. دادوەرێکیش پێیوایە زۆرینەی زۆری ئەو بکوژانەی ناسیونی، کاتێ کە بەرەبەیان ریشیان تاشیوە، نەیانزانیوە ئێوارە کەسێك دەکوژن. کەواتە واباشە، لە پێناوی ئاسایشییو عیبرەتدانا، رووی سزادراو لەبەردەم هەمو ئەوانەی بەیانیان ریش دەتاشن هەڵماڵرێت، لەبری ئەوەی بە ماسك روویان داپۆشرێت.

دەوڵەت روخساری پرۆسەی لەسێدارەدان جوان دەکات، ئەم نووسینو راپۆرتانەش لەگۆ دەخات. کەواتە بڕوای بە بەهای پەندوەرگرتن نییە لە سزاداندا، تەنها وەك نەریتێکی کۆن ئەم کارە ئەنجام ئەداتو خۆی بەبیرکردنەوە ماندو ناکات. ئەوان بۆیە تاوانبار

دەکوژن چونکە سەدان ساڵە تاونبار دەکوژرێت، بەهەرحاڵ ئەوان لەسەر شێوازێکیش دەیانکوژن کە لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمدا بۆ کوشتن دیاری کراوە. بەم چەشنە، ئەوان وەك رۆتینێك بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەیان پشت بە هەمان ئەو بیانوانە دەبەستن کە لەو سەدانەدا باو بوون. ئەوان یاسا جێبەجێ دەکەن بێ ئەوەی مشتومڕی لەسەر کەن، سزادراوانی ئێمە بەناوی تیۆرێکەوە دەمرن کە ئەنجامدەرانیشی باوەڕیان بە تیۆرەکە نییە. ئەم کارەی ئەوان ئارەزووی سادیستانە لەلای مرۆڤەکان بەخەبەر دێنێ، ئارەزوویەك کە دەرئەنجامەکانی لە هەژمار نایەن، لە کۆتایی رۆژێکیشدا خۆی دەخاتە باوەشی تاوانێکی نوێوە، کە دیسان هەڕەشە لەسەر وروژاندنی یاخیبوون‌و بێزهاتنەوەی رای گشتی دروست دەکات. ئەگەر بێین پرۆسەکانی جێبەجێکردنی سزای لەسێدارەدان وەرگێڕینە سەر چەند وێنەیەکی زیندو لە خەیاڵی گەلدا، دەبینین ئەمرۆکە لە وڵاتەکەماندا تا دێ جێبەجێکردنی سزای لەسێدراەدان قورستر دەبێت.

ئەو دەق‌و نووسینانەی کە من باسمکردن رەنگە لەلای هەندێ مامۆستای مافناس بە وێنەیەکی جوان بێتە بەرچاویان، مامۆستا گەلێك کە بێ توانان لە بیانوهێنانەوە بۆ ئەم سزایەی کە لەدژی گیانی سەردەمە، بۆیە پاشکۆیەتی کۆمەڵناس (تارد) دەکەن کە دەڵێت:

مراندنی مرۆڤ بێ ئازاردانی باشترە لە ئازاردانیو نەمراندنی. هەر بۆیە دەبێ پشتگیری (گام-بیتا) بکەین بۆ هەڵوێستی، کە ئەو خۆی یەکێکە لە دژبەرانی سزای لەسێدارەدان، دەنگی لەدژی پرۆژە یاسایەك دا کە لە برِگەیەکیدا رێگە دەگیرا لە بلاّوکردنەوەی هەواڵ لەبارەی پرۆسەکانی ملپەڕاندن. ئەو رایگەیاندو وتی: "ئەگەر بتانەوێ قیزەونی ئەو دیمەنە بشارنەوە، ئەگەر بتانەوێ ملپەڕاندن لەنێو گرتوخانەکاندا ئەنجام بدەن، ئەوا ئەو راپەڕینە گشتییە یاخیە دەشارنەوە کە لە ساڵانی دواییدا سەری هەڵدا، کۆڵەکەکانی سزای مەرگیش قایمتر دەکەن".

لە راستیدا یان دەبێ بە ئاشکرا بکوژرێن یان دەبێ دان بەوەدا بنرێ کە دەوڵەت دەسەلاّتی کوشتنی نییە. وەگەر کۆمەڵگە لەبەر پێویستیی پەندوەرگرتن سزای مەرگ بەهانەدار دەکات، ئەوا دەبێ داوا بکات ئەو کارە بە ئاشکرا ئەنجام بدرێت. دەبێ هەموو جارێ دەستەکانی جەلـلادەکە هەڵبڕێو ئاشکرایانکات، هاولاّتیە هەست ناسکەکانیشی ناچارکات تەماشایکەن، هەموو ئەوانەش کە دوورو نزیك هۆکارن بۆ بوونی ئەم جەلـلادە، ناچاریانکات تەماشای دەستی جەلـلادەکە بکەن. ئەگەر ئەم کارە نەکات ئەوا دان بەوەدا دەنێ کە ئەو کوشتنێك ئەنجام ئەدات بێئەوەی بزانێت چی دەڵێتو چی

دەکات، یاخود ئەو کوشتنێك ئەنجام ئەداتو ئەزانێت کە ئەم شانۆگەریە بێزراوانە ناتوانێت رای گشتی بترسێنێت، تەنها شتێك کە پێی دەکرێ لەخەوهەستاندنی تاوانو نانەوەی ئاژاوەیە لەنێو کۆمەڵدا. پێدەچێ بەڕێز راوێشکار (ڤالکۆ) کە دادەوەرەو تەمەنێکی زۆری لەنێو ژیانی دادوەریدا بەڕێکردوە، باشترین کەس بێت کە بتوانێت لەم شایەتیەیدا کە بەراستی شایانی ئەوەیە بخوێنرێت، گوزارشت لەم راستیە بکات، ئەو دەڵێت: "تاکە جارێك کە سزای تاوانبارەکەم لەسەر سوك نەکردو حوکمی ملپەڕاندنم بۆ سزادراوێك دەرکرد، سەرباری هەڵوێستم، پێموابوو بە دەروونێکی ساردو ئارامەوە ئامادەی پرۆسەی جێبەجێکردنی سزاکە دەبم. بەهەرحاڵ تاوانبارەکە هێند خۆشەویست نەبوو: چونکە کچەکەی خۆیی ئەشکەنجە دابوو پاشان خستبوویە نێو بیرێکەوە. باشە! دوای ملپەڕاندنی، پاش چەندین هەفتەو بگرە چەندین مانگ، شەوانم بە دێوەزمەی ئەو یادەوە بەڕێدەکرد... منیش وەك هەر کەسێکی تر بەشداری شەرم کردو چەندین گەنجی بێتاوانم بینی مردن، بەڵام دەتوانم بڵێم هیچ کاتێ هێندەی بینینی ئەو دیمەنە سامناکە هەستم بە ئازاری ویژدان نەکرد، کە لە بەردەم جۆرێك لە تیرۆری کارگێڕیانەدا وەستابووم، ئەوەی کە ناوی لێنراوە سزای ملپەڕاندن".

بەڵام پاش هەموو شتێك، بۆچی کۆمەڵگە بڕوای بەم پەندوەرگرتنە هەیە کە تائێستا نەیتوانیوە ڕێگە لە تاوان بگرێت لەکاتێکدا کاریگەریەکانی روونو بەرچاو نین؟ سزای ملپەڕاندن ناتوانێت کەسێك بترسێنێت کە لە بنەڕەتدا نازانێت دەیکوژن، ناتوانێت کەسێك بترسێنێت کە لەپڕ بڕیار لەسەر ئەنجامدانی تاوانێك ئەدات، ناتوانێت کەسێك بترسێنێت کە بۆ وتوێژ دەچێتو چەکێك لەگەڵ خۆی دەبات بۆ ترساندنی نەیارەکەی، دواتر لەگەڵ ئەوەی نایەوێت بەکاری بهێنێت یان پێیوایە نایەوێت بەکاری بهێنێت، بەکاریدێنێت. بە کورتی: ناتوانێت کەسێك بترسێنێت کە لەپڕ خۆی لە نێو تاواندا دەبینێتەوە، واتە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بێهودەیە، بە دەگمەن نەبێ. ئەم دەگمەنیەش موچڕکە بەگیاندا دێنێت.

ئایا لانیکەم ئەو توێژە تاوانکارە دەترسێنێت کە ئەو پێیوایە کاریگەری لەسەریان دەبێت؟ بێگومان ئەمە زۆر دورە لە راستییەوە. (کۆستلەر) دەڵێ لەو سەردەمەدا کە گیرفانبڕەکان لە ئینگلترا لەسێدارە دەدران، دزەکانی تر خەریکی قۆشمەو رابواردن بوون لەنێو ئەو جەماوەرەی لەو قەنارە کۆببوونەوە کە هاوپیشەکەیانی لەسەر لەسێدارە دەدرا. ئامارێك کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا لە ئینگلترا ئامادەکراوە دەریدەخات کە هەموو ١٧٠ لە ئەسڵی ٢٥٠ لەسێدارەدراو پێشتر

جارێك تا دوو جار لە پرۆسەکانی جێبەجێکردنی ملپەڕاندندا ئامادەبوون. لە ساڵی ١٨٨٦ـیشدا، ١٦٤ لە ئەسڵی ١٦٧ سزادراوی مەرگ، پێشتر لە گرتوخانەی (بریستوڵ) گیراون، لانی کەمیش جارێکیش جێبەجێکردنی سزای ملپەڕاندنیان دیوە. لەئێستادا لە فەرەنسا ناتوانرێت ئاماری لەمجۆرە ئامادە بکرێت، چونکە بەیەکجاری سزای ملپەڕاندن پەردەی نهێنی بەسەردا دراوە. بەڵام ڕێگەخۆشکەرە بۆ ئەوەی بیرکەمەوە لەوەی ئەو ڕۆژەی باوکم ئامادەی پرۆسەیەکی جێبەجێکردنی سزای ملپەڕاندن بوو، ژمارەیەکی زۆر لە تاوانکارانی ئاییندە لە دەوری باوکم بوون‌و هێڵنجیان نەداوەو نەڕشاونەتەوە. هێزی ترساندن تەنها کار لەو کەسانە دەکات کە بۆ تاوان نەهاتونەتە دونیاوە، ناتوانێت مل بەو کەسانە کەچکات کە مل کەچ ناکەن. خوێنەر دەتوانێت لە هەر کتێبێکی تایبەتمەند بەم بابەتە هەموو ئەو داتاو ڕاستیانە ببینێت کە لەمبارەیەوە هەن.

ئێمە ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین کە مرۆڤ لە مردن دەترسێت. بێگومان لێسەندنەوەی ژیان توندترین سزایە، ترسێکی یەجگار زۆریش لەلای مرۆڤ دروست دەکات. ترسی مەرگ لە قوڵایی تاریکترین بوونەوەریشدا بەرچاو دەکەوێت. کاتێکیش ئارەزوی ژیان هەڕەشەی دێتەسەر، لەترساندا شێت‌و شپرزو پشێو دەبێ. کەوابێ

بنەمای ڕاستییەك لە باوەڕی ئەو یاسادارێژەدا هەیە کە پێی وایە یاساکەی لەسەر بنەمای پەنهانترین و بەهێزترین ئارەزووی سروشتی مرۆیی دامەزراوە. بەڵام یاسا هەردەم لە سروشت ساناترە. چونکە یاسا کاتێ لەنێو نهێنیەکانی ئارەزووی کوێرانەدا سەرەڕۆیی دەکات تا هەوڵبدات کۆنترۆڵی بکات، لەوەشدا هەر سەرەڕۆیی دەکات کە ناتوانێت ئەو ئاڵۆزییە سادەبکاتەوە کە خۆی دەیەوێت ڕێکیبخات.

ئەگەر ترس لە مەرگ شتێکی بەڵگەنەویست و ئاشکرا بێت ئەوا ئاشکرایە کە ئەم ترسە، هەرچەندە گەورەش بێت، نەیتوانیوە ڕێ لە خولیاو هەوەسی مرۆیی بگرێ. (باکون) ڕاست دەکات کاتێ دەڵێ خولیاو هەوەس هەرچەند لاوازیش بێت دەتوانێت بەسەر ترسی مەرگدا زاڵ بێت. تۆڵەسەندنەوە، خۆشەویستی، ئابڕو، ئازار، هەریەك لەمانە دەتوانن بەسەر ترسی مەگدا زاڵ بن. ئەوەی خۆشەویستی بۆ مرۆڤێك یان بۆ نیشتمان دەیکات، ئەوەی شێت و شەیدای ئازادی دەیکات، چۆن تاوان و ڕق و ئیرەیی ناتوانێ بیکات؟ سزای مەرگ چەندین سەدەیە بەو هەموو کارزانیە وەحشیگەرانەی لەپاڵیدا دەکرێت، هەوڵدەدات ڕێ لە تاوان بگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا تاوان هەر بەرهەڵستی دەکات. بۆچی؟ چونکە ئەو ئارەزوانەی لەنێو مرۆڤدا ململانێ دەکەن بەو شێوە نین کە یاسا دەیەوێت، هێزگەلێکی

جێگیرو هاوسەنگ نین. ئارەزوەکانی مرۆڤ هێزگەلێکی ناجێگیرن، دەمێ دەمرن و دەمێ سەردەکەون، لە ململانێی بەردەوامیدا ژیانی هزریی پەیدا دەکات، وەك پێکهاتەی وزەی کارەبا کە لە چەندین لەرینەوەی کارەبایی لەیەك نزیك پێکهاتوە، ئەو لەرینەوانەی کە رۆژانە هەموومان پێدا تێدەپەڕین. با زنجیرەی لەرینەوەکان لە دۆخی ئارەزووکردنەوە بۆ دۆخی ئارەزوونەکردن وێنابکەین، لەباری جێگیرەوە بۆ باری پەڕاگەندەیی، ئنجا وەرە بیخەرەسەر ناکۆتایی ئەم جوڵانە، ئەوجا بیرۆکەیەکمان لا دروست دەبێت دەربارەی ژیانی دەروونیی و پەرەسەندنی. نێواندارێی هاتوچۆی ئەم هێزانە بەگشتی هێندە خێرایە کە هیچ هێزێکیان پێڕاناگات بەتەواوی کۆنتڕۆڵی بونەوەر بکات. بەڵام رەنگە رووبدات یەکێ لەو هێزانە بتوانێت بواری هەست بە تەواوی داگیربکات، ئەوکات هیچ ئارەزوویەك، تەنانەت ئەگەر ئارەزووی ژیانیش بێت، ناتوانێت بەر بە جەوری ئەو هێزە زەواڵە بگرێت. بۆئەوەی سزای مەرگ توانای تۆقاندنی هەبوایە، دەبوایە سروشتی مرۆڤایەتی جیاوازبوایە لەو شێوەی ئێستا هەیە، دەبا بەچەشنی یاسا پوخت و جێگیر با. بەڵام ئەوکات دەبووە سروشتێکی مردو.

بەو شێوە نییە. هەر بۆیە بکوژ کاتێ کەسێك دەکوژێت هەست دەکات خۆی بێتاوانە. هەموو تاوانبارێك بەر لە دەرچوونی بڕیاری دادگا خۆی بڕیار لەسەر خۆی دەدات کە بێتاوانە، چونکە ئەگەر ئەو پێشی وانەبێ لەو کارەیدا بێتاوانە پێی وادەبێ کە دۆخەکە بیانووە بۆ ئەو کارەی ئەنجامیداوە، واتە بارودۆخ ناچاریکردوە ئەو کارە بکات. ئەو نە بیردەکاتەوە نە چاوەڕواندەکات، ئەگەر بیربکاتەوە ئەوا چاوەڕواندەکات لێبوردنی بۆ دەرچێت. ئاخر چۆن لەشتێك دەترسێت کە ئەو بە گریمانەیەکی زۆر دووری دەزانێت؟ ئەو لەدوای دەرچوونی بڕیاری دادگا لە مەرگ ئەترسێت نەك پێش ئەنجامدانی تاوانەکە. کەواتە بۆئەوەی یاسا هێزێکی هەڵسلەمینەوەی هەبێت نابێ هیچ هیوایەك بۆ بکوژ بهێڵێتەوە، دەبێت یەکلاکەرەوە بێت، نابێت بە سوك کردنی سزاکە رازی بێت. کێ لە وڵاتی ئێمەدا دەوێرێ شتی وەها داواکات؟

ئەگەر مرۆڤێکیش بوێرێ شتی وەها داواکات، ئەوکات دەبێ رەچاوی جیاوازییەکی تری سروشتی مرۆیی بکات. ئارەزووی ژیان گەرچی سەرەکیش بێت، گرنگتر نییە لەو ئارەزووەی تر کە دەروونشیکارە قوتابخانەییەکان قسەی لەسەر ناکەن: کە ئەویش ئارەزووی مەرگە کە هەندێ جار ناچارە بە لەناوبردنی خودو

لەناوبردنی ئەوانی تریش. زۆر جاریش ئارەزووی کوشتن یەخسیری ئارەزووی خۆکوشتن و خۆلەناوبردن دەبێت[5]. بەمشێوە دەبینین ئارەزووی مانەوە، بە رێژەی جیاواز، هاودەمە لەگەڵ ئارەزووی لەناوچوون. لە راستیدا ئارەزووی لەناوچوون بە تەنها خۆی دەتوانێت روونکردنەوەیەکی تەواومان دەربارەی هەرچی لەرێ لادان هەیە پێبدات، هەر لە ئالودەبوونی مەی و مادە بێهۆشکەرەکان و ئەوانی ترەوە کە مرۆڤ بەرەو لەناوچوون دەبەن بێ ئەوەی خۆی لێی بێئاگابێت. مرۆڤ حەزی لە ژیانە، بەڵام بێهودەیە گەر پێمانوابێت ئەم حەزە کۆنترۆڵی هەموو کارەکانی کردوە. ئەو هاوکات حەزیشی لەوەیە کە هیچ نەبێت، ئەو حەزی لە شتێکە بەرەنگاری نەبێت و لە مەرگدا بێت و لەپێناوی مەرگدا بێت. ئیدی هەر بەم جۆرە تاوانبار تەنها حەزی لە ئەنجامدانی تاوان نابێت، بەڵکو حەزی لەو مەینەتیەشە کە بەدوای تاوانەکەیدا دێت، تەنانەت بەتایبەت کاتێك ئەو مەینەتیە هیچ سنورێکی نابێت. کاتێکیش ئەم ئارەزووە گەشە دەکات و بە یەکجاری کۆنترۆڵی دەکات، ئیدی وێناکردنی پرۆسەی ملپەڕاندن نەك تەنها ناتوانێت رێ لە تاوانبار بگرێت بەڵکو گریمانەی ئەوەش

---

[5] هەفتانە لە رۆژنامەکاندا دەخوێنینەوە کە چۆن هەندێ لە تاوانباران تیاماون لە نێوان کوشتنی خۆیان و کوشتنی خەڵکانی دی.

دەکرێت کە هێندەی تر لەو مزراحەدا بیخولێنێتەوە کە تێیدا ونبووە. ئەوکات بەواتایەکی دیکە بۆیە کوشتن ئەنجام ئەدات بۆئەوەی بمرێت. ئەم خەسڵەتە تایبەتانە بەسن بۆئەوەی روونبێتەوە هەر سزایەك کە وادادەنرێت دەروون دەترسێنێت، لە راستیدا هیچ بنەمایەکی بنەڕەتی دەروونناسی تێدا نییە. هەموو ئامارەکان بێ‌جیاوازی، ئاماری ئەو وڵاتانەی کە سزای لەسێدارەدانیان لابردوەو ئەوانەشی کە لایان نەبردوە، دەریدەخەن کە هیچ پەیوەندییەك نییە لەنێوان لابردنی ئەم سزایەو نێوان تاوانکاری[6]، تاوانکاری نە زیاد دەکات نە کەم. قەنارە هەیەو تاوانیش هەر هەیە. پەیوەندییەکی یاسایانەش لەنێوان ئەم دووانەدا بوونی نییە. لەو ژمارەی زۆرانەش کە ئامارەکان خستونیەتە بەردەست تەنها دەتوانین بەم ئەنجامە بگەین: بەدرێژایی چەندین سەدە زۆرێك لە تاوانەکانی تر بەدەر لە تاوانی کوشتن سزاکەی مەرگ بووە، کەچی ئەو سزایە کە جار لەدوای جار و بەردەوام جێبەجێ کراوە، هێشتا نەیتوانیوە رێگە لە بەردەوامیی هیچ کام لەو تاوانانە بگرێت. ئەوە چەندین سەدەشە سزای مەرگ بەسەر ئەنجامدەرانی ئەو تاوانانەدا جێبەجێ ناکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی

[6] راپۆرتی (لیژنەی راسپێردراو)ـی ئینگلیزی بۆساڵی ١٩٣٠ لەگەڵ لیژنەی شاهانەی ئینگلیزی کە لەم دواییانەدا بە توێژینەوەکەدا هەڵچوونەوە دەڵێن: (هەموو ئەو ئامارانەی توێژینەوەمان لەسەر کردوە ئەوەمان لەلا دووپات دەکاتەوە کە لابردنی سزای مەرگ نەبووەتە هۆی زیادبوونی ژمارەی تاوانەکان).

ئەو تاوانانە زیادیان نەکردوە، بەڵکو هەندێکیش کەمی کردوە. ئەوە چەندین سەدەیە هەر کەسێك کوشتنی ئەنجامدابێت بەسزای مەرگ سزادراوە، کەچی بکوژان هەر لەناوناچن. بەڵام دەبینین ڕێژەی تاوانی کوشتن لەو سی و سێ وڵاتەی کە سزای لەسێدارەدانیان لابردوە زیادی نەکردوە. ئیتر لێرەوە کێ دەتوانێت بگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە سزای مەرگ بەراستی ڕێگری لە کەمکردنەوەی تاوان دەکات؟

پارێزگاران ناتوانن نکوڵی لەم راستی و لەم ژمارانە بکەن، تاکە وەڵام و دوایین وەڵامیان نیشانەی خۆیەتی. گوزارشت لەو هەڵوێستە نامۆیەی کۆمەڵگایەك دەکات کە پرۆسەکانی لەسێدارەدانی بە کەشێکی کپکراو تەنیوەو بانگەشەی ئەوە دەکات کە گوایە عیبرەت بەخشە. پارێزگاران دەڵێن: "هیچ شتێك بە راستی نایسەلمێنێت کە سزای مەرگ عیبرەت بەخشە، بەدڵنیاییەوە هەزاران بکوژ لێی نەترساون. بەڵام لە هەمان کاتیشدا نازانین چی دەیانترسێنێت، بەمشێوە هیچ شتێك نایسەلمێنێت کە عیبرەت بەخش نییە". بەپشت بەستن بەم قسانە، مەزنترین سزا کە سزای تری لەدوا نییە، بە توانایەك دەکرێت کە ناتوانرێت بسەلمێنرێت. مەرگ پلەبەندی و گرێمانەی نییە، لە مەرگدا هەموو شتێك جێگیر دەبێت، جەستەو گوناهەکانیشی. بەڵام لە وڵاتی ئێمەدا بەناوی تواناو گرێمانەوە

جێبەجێ دەکرێت. تەنانەت کاتێکیش ئەم گریمانەیە ژیرانە بێت، ئایا پێویستمان بە دڵنیایی نییە تاوەکو ڕێگە بە زۆرترین مەرگی دڵنیایی بدەین؟ سەرئەنجام سزادراو دەکرێت بە دوو پارچەوە، نەك بەهۆی ئەو تاوانەی ئەنجامیداوە، بەڵکو بەهۆی هەموو ئەو تاوانانەی کە دەبوایە ئەنجامبدرانایەو ئەنجام نەدراون، یان بەهۆی ئەوانەی کە ڕەنگە ئەنجام بدرێن و ئەنجام نادرێن. ئەم نادڵنیاییە گەورەیە ڕێگە خۆش دەکات بۆ دڵنیاییەکی چەسپاو.

من تەنها کەس نیم کە سەرسام بم بەم جیاوازییە سەیرە. دەوڵەت خۆیشی سەرکۆنەی دەکات، ئەم ئازاری ویژدانەش ئاماژەیە بۆ ئەو جیاوازیەی کە لە هەڵوێستیدا هەیەتی. دەوڵەت بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕاستیەکان، سزای لەسێدارەدان لە گشت پڕوپاگەندەیەك دادەبڕێت، کە ئێستا لەهەموو کاتێك زیاتر لە ترساندنی تاوانباراندا خزمەتی دەکات، (بیکاریا)[7] لەمبارەیەوە دواوەو نووسیویەتی: "ئەگەر گرنگ بێت گەل ئاشنابێت بەو بەڵگانەی هێزی دەسەڵات دەسەلمێنن، ئەوا پێویستە ئەشکەنجەدانێکی زۆر ئەنجام بدرێت. بەڵام دەبێ تاوانی زۆریش لەئارادا بێت، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە سزای مەرگ ئەو

[7] سیزار بیکاریا: فەیلەسوف و تاوانناسێکی ئیتاڵییە، کاریگەری باشی هەبووە لە کەمکردنەوەی ئەو توندوتۆڵییەی لە یاساکانی سزاداندا هەبووە. (١٧٣٨-١٧٩٤). (وەرگێڕی عەرەبی)

کاریگەریەی نییە کە دەبێ هەیبێت، لەم سۆنگەوە بۆمان دەردەکەوێت کە سزای مەرگ هاوکات بێکەڵك و پێویستیشە".
دەوڵەت دەتوانێت چی لەبارەی سزایەکەوە بکات کە هاوکات بێکەڵك و پێویستیشە، جگە لەوەی بیشارێتەوە بێ ئەوەی لایبەرێت؟ کەواتە دەوڵەت ئەم سزایە هەر دەیهێڵێتەوە، بەڵام بەشێوەیەکی کەنارگیریانە ئەنجامی دەدات، بەو هیوایەی رۆژێك لە رۆژان لانیکەم کەسێك لە سەروبەندی ئەنجامدانی تاوانەکەیدا لەو سزایە بترسێت و بسڵەمێتەوە، بەو شێوە پاساو بۆ یاسایەك دروست دەکات کە چیتر نە ئەقڵ و نە ئەزموونگەرایی پاڵپشتی لێناکەن. کەواتە دەوڵەت ناچارە، چونکە سوورە لەسەر ئەوەی وادەرخات کە قەنارە پەندبەخشە، بۆئەوەی خۆی لە تاوانێکی نادیار لادات کە هەرگیز نازانێت تاچەند ئەگەر هەیە ئەنجام بدرێت. لە راستیدا ئەمە یاسایەکی سەیرە کە بەئاگایە لەو تاوانەی خۆی دەبێتە هۆکاری و بێئاگایە لەو تاوانەی رێگری لێدەکات.
کەواتە ئەگەر دڵنیابین لەوەی سزای ملپەڕاندن توانایەکی تری هەیە، ئەوا ئەو توانایە بە راستی توانایەکی راستێتییە، کە تا رادەی سەرشۆڕی و شێتی و کوشتن مرۆڤ رسوا دەکات.

هەر لە ئێستاوە دەتوانین لە دەرئەنجامە نمونەیەکانی ئەم نەریتانە بکۆڵینەوە کە بۆ سەر رای گشتی هەیانە، لەو دیاردە سادیستانە بکۆڵینەوە کە لە هەناوی رای گشتیدا بەخەبەری دێنێت، لەو سەربلندییە تۆقێنەرە پوچەڵە بکۆڵینەوە کە لەلای هەندێ لە تاوانباران بەدیاریدەخات. هیچ جوامێرییەك لە چواردەوری قەنارەدا بوونی نییە، تەنها هێڵنج و رق سەرشۆڕترین چێژ لەو دەورە بوونیان هەیە. ئەم دەرئەنجامانەش ئاشکران. لە راستیدا شەرم و رووی دەویست قەنارە لە گۆڕەپانی بارەگاکانی حکومەتەوە بگوازرێتەوە بۆ رووپاکان و پاشان بۆ بەندیخانەکان. زانیاریشمان کەمە دەربارەی هەستی ئەو کەسانەی کە پیشەکەیان ناچاری کردون ئامادەی ئەو جۆرە شانۆگەریانە بن. کەواتە با گوێ بگرین لە بەڕێوبەری بەندیخانەیەکی ئینگلیزی کە دان بەوەدا دەنێت "لە رادەبەدەر هەست بە شەرمەزاری" دەکات، پاشان ئەو قەشەی کە باس لە (تۆقاندن و سەرشۆڕی و رسوایی)[8] دەکات. ئینجا با بەتایبەت وێنای هەستی ئەو کەسە بکەین بەبۆنەی پیشەکەیەوە فرمانی کوشتنەکە ئەنجام ئەدات، مەبەستم جەلـلادە. ئەی چی لەبارەی ئەو کارمەندانەوە بڵێین کە بە قەنارە دەڵێن (راکێشەر) و بە سزادراویش دەڵێن (کرِیار) یان

---

[8] راپۆرتی (لیژنەی راسپێردراو) ١٩٣٠.

(بار)! چییان لەبارەوە بڵێین گەر هەمان قسەی قەشە (بیلاجست) نەکەین کە جێبەجێکردنی نزیکەی سی پرۆسەی لەقەنارەدانی دیوە، نووسیویەتی: "زمانی ئەو کەسانەی راسپێردراون بە جێبەجێکردنی سزای ملپەڕاندن هێندەی زمانی تاوانباران شێتانەو بازاڕیانەیە"[9]. دواجار، بزانن یاریدەری جەللادێك چی نووسیوە دەربارەی گەشتەکانیان بۆ لادێکان: "کاتێك گەشتێکمان دەکرد تەواوی رۆژمان بە پێکەنین بەسەردەبرد! ئۆتۆمبێل و چێشتخانەی باشمان بۆ تەرخان کرابووا!". ناوبراو لەباسی لێهاتوویی جەللادەکەیاندا لە بەردانەوەی کاردەکەدا دەڵێت: "لەمیانی پرۆسەکەدا چێژمان لەوە وەردەگرت کە کڕیارەکەمان بە قژ دەبەستەوە". ئەو بەربادیەی لێرەدا گوزارشت لەخۆی دەکات چەندین رواڵەتی قوڵی دیکەی هەیە، دەبینین جلوبەرگی سزادراوەکان دواتر دەبنە موڵکی جەللادەکە. ئەڵێن (دیبەلر)ـی باوك جلوبەرگی هەموو ئەوانەی لەقەنارەی دابوون لە کوخێکی تەختەییدا هەڵیواسیبوون و جارجار دەچوو بۆ تەماشاکردنیان. لەوە مەترسیدارتریش هەیە، وەرن بابزانین یاریدەر جەللادی هاوڕێمان چی دەڵێت: "جێبەجێکارە نوێکەمان شێت و شەیدای قەنارەیە. هەندێ جار چەندین رۆژ بە خۆئامادەکراوی

---

(9) بیلا جست: (سێدارەو خاچ) خانەی پەخشی فاسکیل.

لەماڵەکەیدا لەسەر کورسییەك دادەنیشێت، کڵاوەکەی لەسەرناوەو چاکەتەکەی لەبەرکردوەو چاوەڕوانە لە وەزارەتەوە بانگی بکەن بۆ جێبەجێکردنی سزایەك"(10).

بەڵێ، ئەمە ئەو مرۆڤەیە کە (جۆزێف دی میستەر) لەبارەیەوە دەڵێت: بۆئەوەی وەها مرۆڤێك بوونی هەبێت پێویستی بە فەرمانێکی تایبەتی هێزی یەزدانی هەیە، بەبێ ئەم جۆرە مرۆڤانە (پشێوی جێگای سیستەم دەگرێتەوە، عەرشەکان دەهێنرێنە خوارەوە، کۆمەڵگە لەناو دەچێت). ئەمە ئەو مرۆڤەیە کە کۆمەڵگە بە تەواوی لە تاوانبار رزگار دەکات، مادەم جەلـلاد واژوو لەسەر پەڕاوی ئەستۆپاکی دەکات و پیاوێکی ئازاد دەخرێتە ژێر دەسەڵاتیەوە. ئەو نموونە جوان و باڵایەی پرۆژەکەمان دایهێناوە، لانیکەم کاریگەرییەکی دڵنیای هەیە کە ئەویش بریتییە لە رسواکردن ئەقڵ و داتەپاندنی خەسڵەتی مرۆیی لای ئەو کەسانەی راستەوخۆ بەشدارن لە پرۆسەکە. رەنگە بوترێ ئەوان بوونەوەری جیاوازو دەستەبژێرن و لەم فرمانە ئاست نزمەدا ئارەزووەکانیان بەجێدێنن. بەڵام ئاخۆ ژمارەی ئەو کەسانەی ئەم قسە دەکەن چەندە کەم دەکات کاتێ دەزانن سەدان کەس هەنداوا دەکەن خۆبەخشانەو بەبێ پارە ببنە جەلـلاد. پیاوانی نەوەی ئێمە، ئەوانەی

---

(10) رۆجێ گارونی: (وەحشەکان)، خانەی پەخشی گالیمار.

مێژووی ئەم ساڵانەی دواییان بەچاوی خۆیان بینی، بەم هەواڵە سەرسام نابن. ئەوان دەزانن ئارەزووی ئەشکەنجەدان و کوشتن لەپشتی روخسارە خۆشحاڵ و خۆشەویستەکانەوە خۆی حەشازداوە. ئەو سزایەی کە وانیشان دەدرێت رێگری لە بکوژێکی نادیار دەکات و لێی دەسڵەمێتەوە، بەبێ گومان رێگا لەبەردەم چەندین دڕندەی تردا دەکاتەوە تا بتوانن ئارەزوویان بۆ کوشتن تێربکەن. ئێستە کە توانیمان بەم گریمانانە پاساو بۆ بێبەزەییانەترین یاسامان بدۆزینەوە، کاتی ئەوە نەهاتووە گومان بکەین کە ئاخۆ یەکێ لەو سەدان کەسەی کە داوایان دەکرد خۆبەخشانە ببنە جەلـلادو ئێمە دەستمان نا بە روویانەوە، بلێی بە رێگایەکی تر ئارەزووە خوێنینەکانی تێر نەکردبێت؟ ئەو ئارەزووانەی کە قەنارە لە ناخیدا بەخەبەری هێنان. ئەگەر کۆمەڵگا دەیەوێت سزای مەرگ بهێڵێتەوە با لانیکەم روپامایی بیانوی ئەوە نەهێنێتەوە کە پەندبەخشە. بە بەناوی خۆی ناوی بێنین، ئەو سزایەیە کە هەموو شێوە جارڕدانێکی رەتدەکەینەوە، ئەو هێزە بەربەستەیە کە کار ناکاتە خەڵکە بەشەرەفەکان، سەرنجی بێشەرەفەکانیش رادەکێشتێت، ئەو هێزی سڵەمینەوەیە کە ئەو کەسانەی دەستیان هەیە لە جێبەجێکردنیدا تووشی بەربادی دەکات. بە راستی سزایە، ئەشکەنجەیەکی بەرجەستەیی و واتایی تۆقێنەرە، بەڵام

بێگومان پەندبەخش نییە، ئەگەر نەڵێین بەدرەوشتانەیە. وەکو وایە بوونی نەبێت تەنها لای ئەو کەسانە نەبێت کە دەمودەست دەیچێژن، تەنها لای ئەو کەسانەی کە بەدرێژایی مانگان و ساڵان بە رۆحیی دەیچێژن، ئەوانەی کە لە کاژێرێکی نائومێدی توندوتیژدا بەجەستەیی دەیچێژن، ئەو دەمەی جەستەیان دەکرێت بەدوو بەشەوە بێ‌ئەوەی گیانیان بکێشرێت. با چیدی بەو ناوەیەوە بانگی بکەین کە لەبەر ئەوەی هیچ جوامێرییەکی تیا نییە جوامێری راستەقینەی بۆ دەگێڕێتەوە، با ئیدی وەك ئەوەی کە هەیە بیناسین کە ئەویش: تۆڵەسەندنەوەیە.

سزایەك کە تەنها سزابێت و خەڵك نەهێنێتە سەر رێگەی راست پێی دەوترێت تۆڵەسەندنەوە. ئەم سزایە بریتیە لە وەڵامێکی نیمچە ژمێریاری کۆمەڵگا پێشکەش بەو کەسانەی دەکات کە یاسا سەرەکیەکەی پێشێل دەکەن. ئەم وەڵامە هێندەی مرۆڤ کۆنەو پێی دەوترێ تۆڵە. هەرکەسێ خراپە بەرامبەر بە من بکات دەبێ خراپەی بەرامبەر بکرێت، هەرکسێکیش چاوم تەقێنێ دەبێ کوێربکرێت، هەرکەسێکیش کەسێك بکوژێت دەبێ بکوژرێتەوە. ئەم پرسە پرسی سۆزە، سۆزێکی یەجگار توندوتیژ، پرسی پرنسیپ نییە. تۆڵە بەستراوەتەوە بە سروشت و ئارەزووەوە، نەبەستراوەتەوە بە یاساوە.

یاسا بەپێی ئەو پێناسەی کە هەیەتی ناکرێ ملکەچی رێساکانی خودی سروشت بێت. وەگەر کوشتن لە سروشتی مرۆڤەوە بێت، ئەوا یاسا بۆئەوە دانەڕێژراوە چاو لەم سروشتە بکات یان کۆپی بکاتەوە. یاسا بۆ ئەوە دارێژراوە ئەو سروشتە چاك بکاتەوە. لە راستیدا تۆڵەسەندنەوە جوڵەیەکی سروشتیی پوخت پشتڕاست دەکاتەوەو هێزی یاسای پێدەبەخشێ. هەموومان ئەم جوڵەیەمان ناسی، زۆر جاریش لەهەمبەریدا هەستمان بە شەرمەزاری کرد، ئێمە ئێستا سەرچاوەی هێزەکەشی دەزانین: لە دارستانە بەکارنەهێنراوەکانەوە بۆمان دێت. ئێمەی فەرەنسی دەمێك سەرکۆنەی پاشای پترۆڵ دەکەین لە شانشینی سعودی کاتێ کە لەلایەك ئامۆژگاری دەدات لەبارەی دیموکراسی نێودەوڵەتی و لەلایەکی تریش فەرمان دەدات بە کوشتارچیەك دەستی دزێك ببڕێتەوە، دەمێکی تریش لە چاخێکی نێوەندا دەژین کە تەنانەت خاوەنی نەوازشی باوەڕیش نییە. ئێمە تا ئێستاش دادپەروەری بەپێی رێساکانی لێکدانەوەیەکی رەق و ئەستور دەناسینەوە[12]. جا ئایا لانیکەم دەتوانین بڵێین ئەم لێکدانەوە وردو

---

[12] چەند ساڵێك پێش ئێستا دواکارییەکم پێشکەش کرد بۆ لێبوردن لە شەش هاوڵاتی تونسی کە سزای مەرگیان بەسەردا سەپێنرابوو، چونکە لە خۆپیشاندانێکدا سێ ئاسایشی فەرەنسییان کوشتبوو. ئەو بارودۆخەی ئەو کوشتنانەی تێدا ئەنجامدرا وایکردبوو قورس بێ بەرپرسیاریەتیەکان دابەش بکرێت. یاداشتنامەیەکم لەلایەن سەرۆکایەتی کۆمارەوە بەدەست گەیی کە تێیدا باس لەوە دەکرا سکاڵاکەم سەرنجی دەستەی تایبەتمەندی بەلای خۆیدا راکێشاوە. بەڵام بەدبەختانە کاتێك ئەم یاداشتنامەیە ئاراستەی

راستە، دادپەروەری ئەگەرچی سەرەتاییش بێت و تەنها پشتی بە تۆڵەسەندنەوەیەکی یاسایانە بەستبێ، ئایا دەتوانین بڵێین بەسزای مەرگ دەتوانێت پاراستن و ئاسایش بەرقەرار بکات؟ دەبێ لە وەڵامدا بڵێین نەخێر.

با ئەو راستیە بخەینە لاوە کە یاسای تۆڵە ناتوانرێت جێبەجێ بکرێت و پێمان وادەبێت سوتاندنی ماڵی کەسێك کە ئاگری کردۆتەوە سزایەکە زیادەڕەوی تێدا کراوە. با رازی بین بەوەی کە کارێکی دادپەروەرانەو پێویستە بۆ قەرەبووکردنەوەی قوربانییەك بکوژەکە بکوژینەوە. بەڵام جێبەجێکردنی سزای ملپەڕاندن تەنها بەمانای مردن نایەت، بەڵکو لە رووی کرۆکەوە جیاوازە لەوەی کەسێك لە ژیان بێبەشکەیت، چەندە سەربازگەی دەستبەسەراگرتن لە بەندیخانە جیاوازە ئەو دووانەش هێندە لەیەکدی جیاوازن. سزای مەرگ بێگومان تاوانی کوشتنەو قەرەبووی تاوانێکی تری ئەنجامدراوی پێدەکرێتەوە. بەڵام چەند نەریتێکی پەیڕەوکراو بۆ مردن زیاد دەکات، پلانێکی گشتیش بۆ کوشتن نیشانی قوربانی داهاتوو

---

من کرا، دوو هەفتە پێشتر خوێندبوومەوە کە بڕیارەکەی دادگا بەسەر سێ کەسیان جێبەجێ کراوە. ئەوەبوو سیانیان لەسێدارە دران و سیانەکەی تریش لێبوردنیان بۆ دەرچوو. هۆکاری لێبوردنی ئەو سیانەش لە هۆکاری لەسێدارەدانی سیانەکەی دیکە یەکلاکەرەوە نەبوو. بەڵام بێگومان دەبوایە سێ کەس لەسێدارە بدرانایە مادام سێ ئاسایش ببوونە قوربانی.

دەدات، دواجاریش کارێکی بۆ سەربار دەکات کە خۆی لەخۆیدا چاوگی ئازارگەلێکە کە لە مردن ترسناکترە. کەواتە هیچ یەکسانییەك لەنێوانیاندا نییە. زۆرینەی دەستوورو یاساکان کوشتنی پلان بۆدارێژراو لە کوشتنی لەناکاو بە مەترسیدارتر دەزانن. ئێ لە راستیدا لەسێدارەدان زیاتر لە هەر تاوانێکی دی کوشتنی پلان بۆدارێژراوە، ناشتوانرێ بە هیچ تاوانێکی تر بەراورد بکرێ کە تاوانبارێك ئەنجامی دابێ. بۆ ئەوەی لەو نێوەندەدا یەکسانی هەبێت دەبوایە سزای مەرگ بەسەر تاوانبارێکدا بسەپێنرایە کە پێشتر بە قوربانیەکەی وتبێت لە فلان کاژێردا بەشێوەیەکی ترسناك دەتکوژم، ئینجا لەو دەمەوەی ئاگاداری دەکرد بۆ ماوەی چەندین مانگ زیندانی بکردایەو بیخستایەتە ژێر بەزەیی خۆیەوە. درندەیەکی لەمشێوەش لە ژیانی ئاساییدا بوونی نییە.

لێرەشدا کاتێك مافناسە فەرمیەکانمان باسی مردنی بێ ئازار دەکەن، ئەوانیش بۆخۆیان نازانن باسی چی دەکەن. لە راستیدا ئەوان خەیاڵدانیان هەژارە. ئەو ترسە روخێنەرە ئابڕووبەرەی کە بە درێژایی چەندین مانگ و چەندین ساڵ[13] بەسەر سزادراودا دەسەپێنرێت

---

[13] رۆمن کە لەپاش پرۆسەی رزگارییەوە سزای لەسێدارەدانی بەسەردا دەدرێت، بەرلەوەی سزاکەی بەسەردا جێبەجێ بکرێت حەوسەد رۆژ لە نێو زینداندا مایەوە، ئەمەش بە راستی شتێکی ئاستەمە. واباوە سزادراوان سێ تا شەش مانگ لە زینداندا دەهێڵرێنەوە تا ئەو رۆژەی لەسێدارە دەدرێن. بەزەحمەت

خۆی لە خۆیدا سزایەکە لە مردن ترسناکترە، کە بێگومان ئەم سزایە تاوانبار بەسەر قوربانیەکەیدا نەیسەپاندوە. قوربانی لە زۆربەی بارەکاندا بەخێرایی دەچێتە جیهانی مردوانەوە بێ‌ئەوەی بزانێت چی بەسەریدا هاتووە، ئیدی هەرچەند ترسابێتیش لەو توندوتیژیە مەرگهێنەرەی رووبەرووی بۆتەوە. ئەو ساتە تۆقێنەرانەی لەسەر ژیان بۆهەژمار دەکرێت، لەبیرمان نەچێت قوربانی لەو ئانوساتانەدا هیچ وەخت بێ‌هیوا نییە لەوەی رزگاری بێت لەو کارەساتەی رووبەرووی بۆتەوە، بەڵام سزادراو بە پێچەوانەوە بە وردی لەنێو ترسی مەرگدا دەژی. سزادراو بە پێ‌بەخشینی هیوا ئەشکەنجە دەدرێت، پاشان بە نائومێدیەکی ئاژەڵیانە دەترسێنرێت. پارێزەرو قەشە لە رووی بەزەییەوە، پاسەوانەکانیش بۆ ئەوەی ئارام بێت، بە کۆدەنگ دڵنیای دەکەنەوە کە لێبوردنی بۆدەردەچێت. ئەویش لەسەرەتاوە بەتەواوی باوەڕ دەکات، پاشان باوەڕناکات. ئیدی بە رۆژدا هیوای دەبێت و بە شەویشدا بێ‌هیوا دەبێت[14]. هەفتە لەدوای هەفتە تێپەڕی، هیواو نائومێدیەکانی گەورە بوون و وەهایان لێهات کە چیدی بەرگەیان

---

دەتوانرێت ئەم ماوەیەش کەم بکرێتەوە، بە تایبەت لەکاتێکدا کە ئارەزوویەك هەیە بۆ هێلانەوەی چانسی رزگاربوونیان. بەهەرحاڵ من بۆخۆم دەتوانم شایەتی ئەوە بدەم کە لە فەرەنسا بە جددییەوە خوێندنەوە بۆ داواکاری لێبوردن دەکرێت.

(14) لەبەر ئەوەی رۆژانی یەکشەممان سزای لەسێدارەدان جێبەجێ نەدەکرا، بۆیە هەمیشە شەوانی شەممان باشترین شەو بوو لەو بەندیخانانەی تایبەت بوون بە سزادراوانی لەسێدارە.

ناگیرێت. بەپێی قسەی شایەتەکان رەنگی پێستیشیان دەگۆڕێت، ئەو کاریگەریەی ترس هەیەتی لەسەریان لەشێوەی کاریگەری ترشییەك دەچێ. یەکێ لە سزادراوانی بەندیخانەی (فرین) دەڵێ: "گەر بزانیت دەمریت هیچ نییە، بەڵام گەر نەزانیت ئایا دەژیت یان نا ترس و دڵەڕاوکێت بۆ دروست دەکات". (کارتۆش)[15] دەربارەی ئازارە گەورەکەوە دەدوێت و دەڵێت: "وای! لە راستیدا چارەکە کاژێرێکی سەختەو دەبێ بەرێیکەیت". بەڵام پرسەکە پرسی چەندین مانگە نەك چەند خولەکێك. سزادراو ماوەیەکی زۆر پێش کوشتنی دەزانێت کە دەکوژرێت، باشیش دەزانێت کە تەنها لێبوردنێکی شێوە سرووتی ئاسمانی دەتوانێت رزگاری بکات. بەهەرحاڵ ئەو ناتوانێت دەستوەرداتە دادگاییکردنەکەی یان خۆی بەرگری لە خۆی بکات، یاخود کەسێك رازی بکات. هەموو شتێك بەدەر لە خۆی روودەدات. ئەو چیتر مرۆڤ نییە، شتێکە دەبێ جەللادەکان چارەی کەن. ئەو لەهەمبەر پێویستییەکی رەها سزادراوە، لەهەمبەر پێویستیی مادەیەکی بەستوو، بەڵام هوشیارییەك هاودەمیەتی کە خۆی بۆخۆی سەرەکیترین دوژمنیەتی.

---

(15) کارتۆش: سەرۆکی باندێکی بەناوبانگی کوشتن و برین بوو، لەڕادە بەدەر بوێرو بوو. لە (١٦٩٣-١٧٢١) ژیاوە. (وەرگێڕی عەرەبی)

کاتێ ئەو کارمەندانەی کە ناچارن بە کوشتنی ئەم کەسە ناوی (بار)ـی لێدەنێن خۆیان باش دەزانن باسی چی دەکەن. ئەی هەر بەراست ئەوان بار نین؟ لە راستیدا مرۆڤ لە دۆخێکی وەهادا هەر لە بار و بەستە دەچێت، لە باشترین دۆخیدا لە ئاژەڵێکی کۆت و بەندکراو دەچێ. رەنگە هێشتا دۆخی ئاژەڵ باشتر بێت، چونکە ئاژەڵ دەتوانێ خواردن رەتکاتەوەو نەخوات، بەڵام سزادراوان بۆیان نییە خواردنیش رەتکەنەوە، ئەوان ناچارن سیستەمێکی تایبەت بە بەندیخانە پیادەکەن (بۆنموونە لە گرتوخانەی فرین سیستەمی ژمارە چوار پەیڕەو دەکرێ کە ماست و مەی و شەکرو مرەباو کەرە دەرخواردی زیندانیان دەدرێ)، جا ئەگەر هاتوو یەکیان نەیخوارد ئەوا ناچاری دەکەن بە خواردنی، چونکە دەیانەوێ ئەو ئاژەڵەی کە بەنیازن بیکوژن لەو پەڕی تەندروستی باشدا بێت. یەکێ لە سەردەستەی پاسەوانەکانی زیندانی (فرین) باس لەو گیراوانە دەکات کە سزای مەرگیان بەسەردا سەپێنراوەو دەڵێت: "ئەوان زۆر هەستیارن و زۆر زوو بەشت کاریگەر دەبن". ئەمەش گومانی تێدا نییە، ئەگینا چۆن دەتوانن ئەو ئازادی و ئابڕووە بەدەست بهێننەوە کە مرۆڤێك هەستی پێدەکات وەختێ شتێکی دەوێت و ناتوانێت دەستبەرداری بێت؟ سزادراو لەو دەمەوەی بڕیاری دادگای بەسەردا دەخوێنرێتەوە، ئیتر

ئەگەر هەستیار بێت یان نا، دەکەوێتە نێو ماشینێکی نەگۆڕەوە. ئەو چەندین هەفتە لە ڕۆتینێکدا دەژی کە دەست بەسەر هەموو جموجۆڵەکانیدا دەگرێت، لە کۆتاییشدا دەیداتە ئەو دەستانەی کە لەبەردەم ئامێری کوشتندا رایدەکشێنن. چیدی ئەم بەستەیە بەدەستی ئەو ڕێکەوتەوە نامێنێت کە مرۆڤی بەدەستە، لەوەبەدوا ملکەچی یاساگەلێکی میکانیکی دەبێت کە ڕێگەی پێدەدات تەنها بیر لەوە بکاتەوە لە ڕۆژی دیاریکراودا بە بێهەڵە ملی پەڕێنن.
ئەو ڕۆژە سنورێك بۆ شتبوونی ئەم دادەنێت. دڵنیابوونی لەو مەرگە ناکامە، لەماوەی سێ چارەکە کاژێری پێش پرۆسەی لەسێدارەدانی، بایی هەموو شتێکە. ئەم چوارێ کۆتکراوە بێبارە لە دۆزەخێکدا ئەژی کە گەلێك لەو دۆزەخە نارەحەت ترە کە پێشتر هەڕەشەیان پێدەکرد. هێشتا یۆنانیەکان سەرباری هەموو شتێك مرۆڤدۆست تر بوون، ئەوان سزادراوانیان ژەهرخوارد دەکرد، ئینجا تا رادەیەك ئازادییان بە سزادراوانیان دابوو، دەیانتوانی کاژێری مەرگیان بەدەستی خۆیان نزیك بکەنەوە یان دوایخەن. سەربەستیان دەکردن لەوەی خۆیان خۆیان بکوژن یان لەسێدارە بدرێن. بەڵام ئێمە، بۆئەوەی لە ئارامی زیاتردا بژین، خۆمان بەدەستی خۆمان دادپەروەری بەجێدەگەیەنین. بەڵام لە ڕاستیدا هیچ دادپەروەرییەك

لەمەی ئێمەدا نییە، مەگەر سزادراویش پێش چەند مانگێك بە قوربانیەکەی بڵێت کە بەنیازە بیکوژێت، ئینجا بچێتە ماڵەکەی و بەباشی بیبەسێتەوە، پاشان پێی بڵێ کە کاژێرێکی تر دێت و لەناوی دەبات، لە ماوەی ئەو کاژێرەشدا خەریکی ئامادەکردنی ئامێری کوشتن بێت. ئایا تا ئێستا بینومانە تاوانبارێك بەمشێوە ناکامە بڕیاری لەسەر قوربانیەکەی دابێت؟

بێگومان ئەمە هۆکاری ئەو سەرشۆڕی و مەلولیەیە کە سزادراوان لە ساتەوەختی لەسێدارەدانیاندا بە روخساریانەوە دیارە. هەرچەندە ئەوان دەتوانن، پاش ئەوەی هەموو هیوایەکیان لەدەستداوە، سەرکێشی بکەن و مردنیان بە فیشەکێکی وێڵ پێباشتر بێت، یان دەبێت لەپاش جەنگێکی تاقەت پڕوکێن ملیان بپەڕێنرێت. ئەمەیە ئازادی هەڵبژاردنی شێوازی مەرگ لەلای ئێمە. لەگەڵ ئەوەشدا تاکە رێسای پەیڕەوکراو ئەوەیە کە دەبێت سزادراو بێ بەرگری و ملەتاتکێ سزاکەی بەسەردا جێبەجێ بکرێت. هەڵبەتە رۆژنامەنووسەکانمان هەر مەبەستیان ئا لەمەیە کە دەڵێن سزادراو ئازایانە مرد. ئیتر دەبینین لێرەو لەوێ مقۆمقۆی لەسەر دروست دەبێت کە مەردانە توانیویەتی لە بارو بەستە دەرنەچێت، هەموانیش لەهەمبەر ئەم ئازایەتیەی سوپاسگوزاری دەکەن. ئەم ئاکارە جوانەی

کە سزادراو لەم پرۆسە قێزەونەدا دەریدەخات، کە ناهێڵێت ئەم قێزەونیە هێندە درێژە بکێشێت و زوو خۆی بەدەستەوە ئەدات، دەبێتە مایەی سوپاس و پێزانینی خەڵك. بەڵام هەموو ئەم پیاهەڵدان و بەئازازانینە بەشێکن لەو چاوبەست و فێڵکردنە گشتیەی چواردەوری سزای مەرگیان داوە. سزادراو هەتا زیاتر بترسێت ئاکاری جوانتری لێدەوەشێتەوە، واتە ئەگەر ترس و هەستی خۆبەدەستەوەدانی زۆر بێت ئینجا دەبێتە شایەنی پیاهەڵدانی رۆژنامەوانەکانمان. هەندێك سزادراو، جا چ سیاسی بن یان نا، قارەمانانە دەمرن، دەبێت بەرێزو سەرسامیشەوە باسیان بکرێت. بەڵام زۆربەیان هیچ بێدەنگییەك ناناسن بێدەنگیی ترس نەبێ، بەهیچ کەودەنیەکیش ئاشنا نین کەودەنیی تۆقاندن نەبێ. بەلای منەوە ئەم بێدەنگیە ئارەزومەندانەش شایەنی رێزێکی زیاترە. کاتێ قەشە (بیلاجست) داوا لە گەنجێکی سزادراو دەکات، کە چەند ساتێکی ماوە لەسێدارە بدرێت، نامە بۆ کەسوکاری بنوسێت، گەنجەکە لەوەڵامدا دەڵێت: "ناوێرم"، ئیتر چۆن ئەم قەشەیە کاتێ دەبیسێت ئەم مرۆڤە دان بە لاوازی خۆیدا دەنێت، لەبەردەم مەزنترین بێنەوایی و پیرۆزیی مرۆڤدا نانەوێ؟ ئەو کەسانەی کە بێدەنگن، ئەوانەی کە راستی هەستیان لەو دڵۆپە ئاوەوە دەزانین کە لەو شوێنەدا دەیرژێن کە چیدی لێیان زەوت دەکرێ،

 

کێ دەوێرێ بەم کەسانەی بڵێ ئەمانە بە ترسنۆکی مردن؟ ئیتر بۆ دەبێ ئەوانەی سزادراون بەمجۆرە ترسنۆکیە وەسفکەین؟ دواجار هەموو بکوژێك کاتێك کوشتنێك ئەنجام ئەدات سەرکێشی دەکات بەوەی رووبەرووی سامناکترین جۆری کوشتن بێتەوە، لەکاتێکدا ئەوانەی کە بکوژەکە دەکوژنەوە سەرکێشی بەهیچەوە ناکەن و هیچ مەترسییەکیان لەسەر نییە، بەپێچەوانەوە رەنگە پلەشیان بەرز بکرێتەوە.

نەخێر، ئەوەی مرۆڤ لەو ساتەدا هەستی پێدەکات سنوری هەموو رەوشتێکی تێپەڕاندوە. چونکە نە چاکەکاری و نە ئازایەتی و نە زیرەکی و تەنانەت نە بێتاوانیش، هیچ رۆڵێکیان لێرەدا نییە. کۆمەڵگە لەو ساتەدا بەتێکڕا دەگەڕێتەوە بۆ چاخە سەرەتاییەکان کە تێیاندا ناتوانرێت بڕیار لەسەر هیچ بدرێت. بەجارێك داد و شکۆو ئابڕو ون دەبن. "بێتاوانی لەهەمبەر مامەڵەی خراپدا بوونی نامێنێت... چەندین دزی راستەقینەم دیوە ئازایانە رووبەرووی سزای ملپەڕاندن دەبنەوە، لەکاتێکدا چەندین بێتاوانم دیوە بە لەرزۆکی بەرەو رووی قەنارە رۆشتون"(16). کاتێکیش قەشەکە دەڵێت بە ئەزموون بۆم دەرکەوتوە خەڵکانی رۆشنبیر لە هەمووان لاوازترن لە بەردەم

---

(16) بیلاجست، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

قەنارەدا، مەبەستی ئەوە نییە ئەم دەستە مرۆڤە ئازایەتیان کەمتر بێت، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە خەیاڵیان زیاترە. مرۆڤ بیروباوەڕی هەرچۆن بێت، کاتێ ناچار دەبێ رووبەرووی مەرگ بێتەوە رۆحی سەرەوخوار دەبێ و تێکدەشکێ[17].

هەستی سزادراو لەمەڕ ئەو هاوپەیمانیەتیە گشتییەی مەرگی ئەویان دەوێت خۆی لە خۆیدا سزایەکی بێهاوتایە. هەر لەم بارەشەوە، باشتر وایە سزای لەسێدارەدان بەئاشکرا جێبەجێ بکرێت. ئەوکات ئەو کاراکتەرە شاراوەی لە پێستی هەموو مرۆڤێکدا خۆی شاردۆتەوە دەتوانێت بێت بەهانای ئەو ئاژەڵە تۆقیوەوەو یارمەتی بدات لەوەی بە وێنەیەکی دلێرانەوە دەرکەوێت، تەنانەت لەبەردەم خۆیشیدا. بەڵام شەو و بێدەنگی رێگە بە هیچ فریادڕەزییەك نادات. ئازایەتی و هێزی رۆح و باوەڕ، لە وەها دۆخێکی کارەساتباودا، هەڕەشەی ئەوەیان لەسەرە کە ئەوانیش تەنها گریمانە بن. چاوەڕوانی سزای مەرگ پێشوەختە مرۆڤ تێکدەشکێنێ. بەمشێوە ئەو دوو جار دەمرێت کە یەکەمیان لە دووەمیان ئاستەم ترە، گەرچی ئەو تەنها یەك جار

[17] پزیشکێکی گەورە کە ئەو خۆی کاسۆلیك بوو، جارێکیان پێی وتم ئەو نەخۆشانەی کە دێنە لای ئەگەر نەخۆشی شێرپەنجەیان بێت و تیماری نەبێت هیچ وەختێ بە راشکاوی پێیان ناڵێت کە ئەو نەخۆشیەیان لەگەڵدایە تەنانەت گەر نەخۆشەکان باوەڕداریش بن، چونکە توشی وەها شۆکێك دەبن کە ژیانیان دەشێوێنێت و تەنانەت هەڕەشە بۆسەر باوەڕیشیان دروست دەکات.

کوژراوە. وەگەر سزای تۆڵە بەم ئازارە بچوێنین، ئەوکات دەبینین وەك یاسایەکی مەدەنی دێتەپێش چاو. هەرچەندە هەرگیز بانگەشەی ئەوەی نەکردوە کە دەبێت هەردوو چاوی ئەو کەسە بتەقێنرێت کە چاوی براکەی کوێرکردوە.

بەهەرحاڵ، ئەم ستەمە بنچینەییە، لەپاشانیش کاریگەری لەسەر کەسوکاری لەسێدارەدراو دەمێنێتەوە. گومان لەوەدا نییە کە کەسوکاری قوربانی دەستی بکوژەکە ئازاری لەڕادەبەدەریان هەیەو لە زۆربەی دۆخەکاندا ئارەزووی تۆڵەسەندنەوە دەکەن. ئەوان تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە، بەڵام کەسوکاری سزادراو لە بێنەواییەکی پەرگیردا دەژین کە هیچ دادێك بوێری ئەوەی نییە سزای لەسەر بدات. چاوەڕوانی دایکان و باوکان بە درێژایی ئەو هەموو مانگە، قسە هەڵبەستراوەکانی هۆڵی پێشوازی زیندان، دیمەنەکانی جێبەجێکردنی ملپەڕاندن، هەموو ئەمانە ئازارگەلێکن کە بەسەر کەسوکاری قوربانی یەکەمدا نەهاتووە. جا هەستی ئەوانی تر هەرچۆن بێت هەر ناتوانن ئارەزووی ئەوە بکەن کە تۆڵەسەندنەوەکە زۆر لە تاوانەکە گەورەتر بێت، هەر ناتوانن ئارەزووی ئەوەبکەن ئازاری کەسانێك بدرێت کە وەك ئەوان ئازاری تایبەتیان هەیە. سزادراوێك نووسیویەتی: "جەنابی قەشە لێبوردنم بۆ دەرچوو، بەختەوەرییەك

بەسەرمدا رژا کە هێشتا کاریگەری لەسەرم ماوە. لە ٣٠ نیساندا لێبوردنم بۆ دەرچوو، رۆژی چوارشەممە کە لە هۆڵی پێشوازی زیندان گەڕامەوە هەواڵەکەم پێگەیی، خێرا گەڕامەوەو فریای دایە و بابەم کەوتم کە هێشتا لە زیندانەکە نەچووبوونە دەرەوە هەواڵەکەم پێڕاگەیاندن. خۆت بیهێنە پێش چاوت ئەبێ چەندە دڵخۆش بووبن بەم هەواڵە"[18]. ئێمە بە راستی ئەو دڵخۆشیەی ئەوانمان دێتەپێش چاو، بەڵام با ئەو بێتاقەتیە هەمیشەیەشیان لەپێش چاو بگرین کە تا کاتی بڕیاری لێبوردنی کوڕەکەیان تێیدا ژیاون، با وێنای ئەو نائومێدیەش بکەین کە تووشی ئەوانی تر دێت کە هەواڵەکەی تریان پێدەگات، هەواڵی ملپەڕاندن.

بۆئەوەی بە یەکجاری کۆتایی بەم یاسای تۆڵەسەندنەوە بهێنین، دەبێ بزانین کە کارکردن بەم یاسای تۆڵەسەندنەوە بەو شێوە سەرەتاییەی کە دەکرێت، تەنها لەنێوان دوو تاکدا ئەنجام ئەدرێت، یەکەمیان بە تەواوێ بێتاوانەو دووەمیان بە تەواوی تاوانبارە. گومان لەوەدا نییە قوربانیەکە بێتاوانە، بەڵام ئایا ئەو کۆمەڵگایەی کە ئەرکە لەسەری نوێنەرایەتی ئەو بکات دەتوانێت بانگەشەی بێتاوانی بۆخۆی بکات؟

---

(18) قەشە دیڤویودی بەڕێز هەروەها دەڵێت: ئاستەمە تێکنەچین، ئەگەر بێتو ئەو داواکاری و سکاڵانامانە بخوێنینەوە کە دایکان و باوکان پێشکەشی دەکەن بۆ لێبوردن لە رۆڵەکانیان، کە وادیارە خۆشیان نازانن چ چەشنە سزایەکە بەسەریاندا دێت.

ئایا لانیکەم ئەگەر بەشێکی کەمیش بێت بەرپرسیارەتی ئەو تاوانەی ناکەوێتە ئەستۆ کە بەم دڕندەییە ئەنجام ئەدرێت؟ زۆر کەس لەمبارەیەوە قسەی کردوە، منیش ناگەڕێمەوە سەر ئەو پاساوانەی کە زۆربەی بیرمەندانی سەدەی هەژدە پێشکەشیان کرد. دەتوانین پوختیان بکەینەوەو بڵێین هەموو کۆمەڵگایەك چەندی شایەنە هێندە تاوانباری هەیە. بەڵام ئەگەر باسی فەرەنسا بکەین ئەوا ئەستەمە ئاماژە بەو دۆخە نەدەین کە تێیدا یاسادارێژەکانمان ناچاربوون لەخۆبوردەتر بن. ئەفسەرێك لەمیانی وەڵامدانەوە لێکۆڵینەوەیەك کە (فیگارۆ) لەساڵی ١٩٥٢ سەبارەت بە سزای مەرگ ئەنجامیدا، دووپاتی کردەوە کە سەپاندنی (زیندانیی هەتاهەتایی و کارپێکردنی قورس)، وەکو ئەوە وایە بەدەستی خۆت پەیمانگای تاوانکاری دابمەزرێنیت. وادیارە ئەم ئەفسەرە خۆشبەختانە نازانێت کە هەر لەئێستاوە پەیمانگای تاوانکاریمان هەیە، تەنها جیاوازییەکیشی لەگەڵ گرتوخانەکانماندا ئەوەیە کە هەر وەختێ بتەوێ بچیتە دەرەوە شەو بێ یان ڕۆژ دەتوانیت: مەبەستم لە مەیخانەو گومەزە گەنیوەکانە کە بوونەتە شکۆی کۆمارەکەمان. ئەستەمیشە بتوانین دادگەرانە لەسەر ئەم خاڵە بدوێین.

بەپێی ئامارەکان بێت ژمارەی یەکەکانی نیشتەجێبوون لە ناوچە چڕەکانی شاری پاریس بە تەنها خۆی بەنزیکەی (٦٤,٠٠٠) یەکە دەخەملێنرێت، کە هەر ژوورێك ٣ تا ٥ کەس نیشتەجێیەتی. گومان لەوەدا نییە کە منداڵکوژەکان بوونەوەرێکی یەجگار سوك و نامەردن و شایەنی بەزەیی نین. ئەگەری ئەوەش هەیە (دەڵێم ئەگەری ئەوەش هەیە) یەکێك لە خوێنەرەکانم، لەوانەی لەم چەشنە ناوچە چڕانەدا دەژین کە تێیدا مرۆڤەکان بەیەکەوە لکاون، پەرگیری بکات و منداڵێك بکوژێت. کەواتە هیچ بوارێك نییە بۆ کەمکردنەوەی تاوانی هیچ دڕندەیەك. بەڵام ئەم دڕندانە ڕەنگە چانسی ئەوەیان نەبێت تا ئەو رادەیە پەرگیر بن، گەرچی لە شوێنی گونجاویشدا نیشتەجێ بن. کەمترین شت کە دەتوانین لەبارەیانەوە بڵێین ئەوەیە کە تەنها ئەوان نین تاوانبارن، ڕەنگە قورسیش بێت کە دەبینین مافی سزادانیان بەدەست کەسانێکە هێندەی پارە بۆ چاندنی چەوەنەر تەرخان دەکەن هێندە بۆ پرۆژەکانی تەلارسازی تەرخان ناکەن[19].

بەکاربردنی مەی هێندەی تر ئەم ئابڕوچوونە گەورەتر دەکات. ئاشکرایە کە گەلی فەرەنسا لەبەر چەند هۆکارێکی بێئابڕوانە لەلایەن زۆرینەی پەرلەمانتارانەوە بەشێوەیەکی ڕێکخراو ژەهرخوار کراوە. لە

---

(19) فەرەنسا بەپلەی یەکەم دێت لە ریزی وڵاتانی بەکاربەری مەی، بەڵام بە پلەی پانزەیەم دێت لە ریزی وڵاتە تەلارسازەکان.

راستیدا ڕێژەی بەرپرسیارێتی کحول لە دروستبوونی تاوانەکانی خوێنڕشتن گەلێك سامناکە. بەڕێز پاریزەر (گیۆن) خەملاندنی بۆ ئەو ڕێژەیە کردوەو پێی وایە بە ڕێژەی ٦٠٪، دکتۆر (لاگریف)-یش پێی وایە ڕێژەکە لەنێوان ٤١,٧٪ و ٧٢٪. لێکۆڵینەوەیەکیش کە لەساڵی ١٩٥١ لە ناوەندی هەڵبژاردنی گرتوخانەی (فرین) کە لەسەر ئەو سزادراوانەی بەناوی مافی گشتییەوە سزادراون ئەنجامدراوە، دەریدەخات کە ٢٩٪ سزادراوان ئالودەی مەین و ٢٤٪ کەسوکاری کەسانێکن کە ئالودەی مەین، ٩٥٪ منداڵکوژەکانیش ئالودەن.

ئەم ژمارانە جوانن. دەتوانین ژمارەیەکی جوانتریش بخەینە ڕوو: کارگەیەکی دروستکردنی مەی لە ساڵی ١٩٥٣ لەبەردەم لیژنەی باجدا لێدوانی داوەو دەڵێت قازانجی گەشتۆتە ٤١٠ ملیۆن، بەراوردکردنی ئەم ژمارانە ڕێگەمان پێدەدات بە هاوبەشانی ئەم کارگەیەو نوێنەرانی مەی بڵێین ئێوە زۆرترین منداڵتان کوشتوە، زۆرتر لەوەی پێتان وایە. بێگومان من لەبەر ئەوەی دژی سزای لەسێدارەدانم داوا ناکەم سزای مردن بەسەریاندا بسەپێنرێت، بەڵام پێموایە واپێویست دەکات، وەك سەرەتایەك، لەژێر چاودێرییەکی سەربازی توندوتۆڵدا، ببرێن بۆ بینینی جێبەجێکردنی سزای

لەسێدارەدانی منداڵکوژێك، پاشان دوای چوونەدەرەوەیان پەڕاوێکیان پێبدرێت ئەو ئامارو ژمارانەی تێدا نووسرابێت کە باسمان کرد.

هەر دەوڵەتێکیش کحول بچێنێت، نابێت سەرسام بێت بە بەرگرتنی تاوان[20]. لە راستیدا سەرسامیش نییە، بەڵکو تەنها خەریکی پەڕاندنی ئەو سەرانەیە کە خۆی بەدەستی خۆی پڕی کردن لە مەی. ئەم دەوڵەتە بێبەزەیانە دادپەروەری پەیڕەو دەکات و مافی قەرزاریش لەئەستۆ دەگرێت، بۆیە ویژدانی ئاسودەیە، هەر وەك ویژدانی ئەو نوێنەری کارگە کحولیەی لە وەڵامی لێکۆڵینەوەکەی (فیگارۆ)دا هاوار دەکات و دەڵێت: "دەزانم ئەو کەسەی زۆر بەپەرۆشە بۆ لابردنی سزای لەسێدارەدان، ئەگەر چەکی بەدەستەوە بێت و لەپڕ بکەوێت بەسەر کەسانێکدا کە بیانەوێت باوکی یان دایکی یان منداڵەکانی یان باشترین هاوڕێی بکوژن، کەواتە چی دەکات!". ئەم (کەواتە)یە خۆی لە خۆیدا بۆنی کحولی لێدێت. بێگومان بەپەرۆشترین کەس بۆ لابردنی سزای لەسێدارەدان فیشەك بەو جۆرە

---

[20] لایەنگرانی سزای لەسێدارەدان لە کۆتایەکانی سەدەی رابردوودا و هەر لە ساڵی ١٨٨٠وە قاوقیژێکی گەورەیان نایەوە دەربارەی زیادبوونی رێژەی تاوان، بەبۆچوونی ئەوانیش ئەم زیادەیە لەبەر کەمی رێژەی لەسێدارەدان بووە. بەڵام لەساڵی ١٨٨٠ یاسایەك دەرچوو کە رێگەی دا بە کردنەوەی فرۆشگای مەی فرۆشی بەبێ مۆڵەت. دە ئینجا با هەوڵ بدەین تێبگەین!

بکوژانەوە دەنێت و کارێکی دروستیش دەکات، ئەمەش نابێتە هۆی ئەوەی دەستبەرداری هیچ کام لەو هۆکارانە بێت کە بەهۆیانەوە سەرسەختانە پاڵپشتی لە لابردنی سزای لەسێدارەدان دەکات. سەرباری ئەمەش، ئەگەر هاتوو ئەو بکوژانە بۆنی کحولیان لێهات، هەقی خۆیەتی پاش تەمییکردنی ئەوان بچێت ئەو کەسانەش تەمێکات کە پەیامیان ژەهراویکردنی تاوانبارانی ئایندەیە. زۆر سەیرە کە تائێستا کەسوکاری قوربانیانی تاوانەکانی کحول بیریان لەوە نەکردۆتەوە بچن و لەژێر سایەی پەرلەماندا داوای روونکردنەوە بکەن. لە راستیدا پێچەوانەی ئەمە روودەدات، دەوڵەتیش کە متمانەی گشتی بەدەستهێناوەو رای گشتی پاڵپشتی لێدەکات، خەریکی فێرکردنی بکوژانە، بەتایبەت ئالودەکانی مەی، وەك چۆن دەویتەکان بەدەوری ئەو کەسە چالاکانەدا دێن کە بژێوی ژیانیان لەسەریانە. بەڵام دەویت رەوشت داناڕێژێت، بەڵام دەوڵەت دایدەڕێژێت. دادگاکانی ئەم دەوڵەتە، سزای کەمتر بەسەر تاوانبارە مەستەکاندا دەدەن و چاوپۆشی لەوەش دەکەن کە ئایا ئەو تاوانبارانە ئالودەن یان نا. هەمیشە ئەو کەیسانەی کە تاوانبارەکانی مەستن تاوانەکانیان توندوتیژی تێدابووە، کەچی هیچ وەختێ بە سزای مەرگ سزا نادرێن، ئەمە لەکاتێکدایە ئەو کەسانەی ئالودەی مەین لە توانایاندایە تاوانی پێشوەخت پلان

بۆدارێژراو ئەنجام بدەن، تاونگەلێك كە شایەنی ئەوەن لەسەری بمرن. كەواتە دەوڵەت تەنها لە یەك دۆخدا هەق بەخۆی ئەدات سزابدات ئەویش لە دۆخێكدا كە بەرپرسیارێتیەكەی راستەوخۆ بگات.

ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە ئیتر دەبێت هەرچی ئالودە هەیە بە نابەرپرسیار بزانین بەرامبەر بەم دەوڵەتە و ئیتر دەبێ دەوڵەتیش هەر لە سینگی خۆی بدات تا گەلەكەی واز لە خواردنەوەی مەی دەهێنێت و لەجێی ئەوە شەربەتی میوە دەخواتەوە؟ بێگومان نەخێر، هەروەك چۆن نابێ ئەو هۆكارانەی دەخرێنە پاڵ بۆماوەییەوە هەموو تاوانێك بسڕنەوە. بەرپرسیارێتی راستەقینەی تاوانكارێك ناتوانرێت بە وردی مەزەنە بكرێت، دەشزانین كە هەژماركردن ناتوانێت ژمارەی باوباپیرانمان بۆ دەرخات، بەوانەی ئالودەبوون و بەوانەشی كە ئالودە نەبوون. لە كۆتایی زەمەندا وەهای لێدێت (١٠ توانی ٢٢) لە ژمارەی ئێستای دانیشتوانی سەر زەوی زیاتر دەبێت. كەواتە ژمارەی ئەو ئامادەكاریە بێ كەڵك و كوشندانەی بۆیان ماوەتەوە لەژماردن نایەن. ئێمە لەژێر قورسایی پێویستییەكی بێ كۆتادا دێینە جیهانەوە، بۆیە دەبێ لەم دۆخەدا چاوەڕوانی هەبوونی نابەرپرسیارێتیەكی گشتی بین. بەپێی ئەم لۆژیكەش بێت نابێ نە سزا بمێنێ نە پاداشت، ئەوكات هەبوونی كۆمەڵگا دەبێتە كارێكی ئەستەم. ئارەزووی پاراستنی

کۆمەڵگەکان و دواتریش تاکەکان، بەپێچەوانەوە پێویستی بەوەیە بەرپرسیارێتی تاك دانپیانراوبێت. ئەم بیرۆکە خۆی لە خۆیدا دەمانگەیەنێتە سەر ئەو ئەنجامەی کە بەرپرسیارێتی سەرتاسەری بوونی نییە، کەوابێ سزاو پاداشتی رەهاش بوونیان نییە. ناتوانرێ هەتاهەتایە پاداشتی مرۆڤێك بدرێتەوە، تەنانەت ئەوانەشی خەڵاتی نۆبڵیان بەدەست هێناوە. کەوایە نابێ هیچ مرۆڤێك بەشێوەیەکی رەها سزا بدرێت، وەگەر تاوانباریش بێت، بەتایبەت کەسانێك کە ئەگەر هەیە بێ‌تاوان بن. سزای مەرگ کە نە ئامانجەکانی عیبرەت بەخشین دەپێکێ نە ئامانجە راستەقینەکانی دادگەری، سەرباری ئەوەش تایبەتمەندیەکی ئابڕوبەرانە بۆخۆی بەدەست دێنێت بەوەی کە گوایە سزای تاوانێکی رێژەیی دەدات بە سەپاندنی سزایەکی یەکجارەکی کە گەڕانەوە لێی مەحاڵە.

ئەگەر سزای مەرگ بە راستی گومانگەری پەندبەخشین بێت و پێلەنگی دادگەری بێت، ئەوا دەبێت لەگەڵ لایەنگرانیدا هاوڕابین لەسەر ئەوەی هۆکارێکە بۆ سڕینەوەی بوون. چونکە سزای مەرگ بە یەکجاری بوونی سزادراو دەسڕێتەوە، لە راستیدا هەر ئەمە بە تەنها بەسە بۆ رەتبوونەوەی بەڵگە فشۆڵ و لاوازەکانی لایەنگرانی سزای لەسێدارەدان. راستیەکەی دەبێ بڵێین سزای مەرگ یەکجارەکییە

چونکە واپێویست دەکات وابێت، دەبێ ئەو راستیەش دووپات بکەینەوە کە هەندێ کەس ناتوانرێ بگێڕدرێنەوە بۆ نێو کۆمەڵگە، مەبەستم لە کەسانێکە کە مەترسی بەردەوامیان هەیە بۆ سەر هەموو هاولاتیەك و بۆ سەر رژێمی کۆمەڵایەتیش، هەر لەبەر ئەمەش دەبێ لەناو ببرێن. بێگومان هیچ کەس نکوڵی لە بوونی هەندێ دڕندەی زیان بەخشی کۆمەڵایەتی ناکات کە هیچ شتێك ناتوانێت هێزو دڕندەییان تێکبشکێنێت. گومان لەوەشدا نییە کە سزای مەرگ ئەو کێشەیە چارەسەر ناکات کە ئەم دڕندانە دەینێنەوە، با لانیکەم رازی بین بەوەی سزای مەرگ ئەم کێشانە دەسڕێتەوە.

دواتر دەگەڕێمەوە سەر ئەو جۆرە کەسانە، بەڵام ئایا سزای مەرگ تەنها بەسەر ئەواندا دەسەپێنرێت؟ ئایا دەوڵەت دەتوانێ بۆمان بسەلمێنێت کە سەرجەم لەسێدارەدراوەکان لەو جۆرە کەسانە بوون کە نەدەتوانرا بگێڕدرێنەوە بۆ نێو کۆمەڵگا؟ ئایا دەتوانن سوێند بخۆن کە بێتاوانێك لەنێویاندا نییە؟ لە هەردوو دۆخیشدا، ئایا نابێ دان بەوەدا بنێن کە سزای مەرگ هۆکارێکە بۆ سڕینەوەی بوون بەئەندازەیەك کە گەڕانەوە لێی مەحاڵە؟ دوێنێ، ١٥ ئازاری ١٩٥٧، لەشاری (کالیفۆرنیا) سزای لەسێدارەدان بەسەر (بارتۆن ئابوت)دا جێبەجێکرا چونکە کچێکی چواردە ساڵانی کوشتبوو. پێموایە ئەم

تاوانە یەکێکە لە تاوانە هەرە قێزەونەکان کە رەنگە نەتوانرێت ئەنجامدەرەکەی چاکساز بکرێت. (ئابوت) هەمیشە جەختی لەسەر بێتاوانی خۆی دەکردەوە، بەڵام بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەرچوو. رۆژی ١٥ ئازاریش، کاژێر دە دیاریکرا بۆ جێبەجێکردنی سزاکە. کاژێر نۆو دە خولەك فەرمان درا جێبەجێکردنەکە راگیرێت بۆئەوەی پارێزەرەکانی دوایین داواکاری لێبوردن پێشکەش بکەن[21]، بەڵام کاژێر یانزە داواکاریەکە رەتکرایەوە. کاژێر یانزەو پازدە خولەك (ئابوت) خرایە نێو ژووری گازەوە، کاژێر یانزەو هەژدە خولەك یەکەمین هەناسە گازاویەکانی هەڵدەمژی، کاژێر یانزەو سی خولەك سکرتێری لیژنەی لێبوردن لەسەر هێڵی تەلەفون قسەی دەکرد. لیژنەکەی رای خۆی گۆڕیبوو، بەدوای دادەوەرکەدا گەڕابوون بەڵام بەڕێزیان لە پانتایی دەریابووبوون، بۆیە ناچار راستەوخۆ تەلەفونیان بۆ زیندان کردبوو. بەهەرحاڵ ئابوتیان لە ژووری گازەکە دەرهێنابوو، بەڵام ناوەخت بوو، چەند ساتێك بەرلەوەی فریای کەون گیانی لەدەستدابوو. ئەگەر دوێنێ کەش و هەوای کالیفۆرنیا گەردەلولاوی بوایە، دادوەری بەڕێز بۆی نەدەلوا بچێت بۆ دەریا، ئەوجا جەنابیان

---

(21) پێویستە ئەوە بڵێین ئەو شێوازەی لە بەندیخانە ئەمریکیەکاندا پەیڕەو دەکرێت بۆ جێبەجێکردنی سزای لەسێدارەدان بریتییە لە گواستنەوەی سزادراو لە ساتەوەختی جێبەجێکردنی سزاکەیدا لە ژوورەکەی خۆیەوە بۆ ژوورێکی تر، پێشی رادەگەینرێت کە چ ئاهەنگێك چاوەڕێیەتی.

دوو خولەك زووتر تەلەفونی دەكرد، بەوشێوە ئابوت ئەمڕۆ زیندو دەبوو، رەنگە بێتاوانبوونیشی بسەلمێنرایە. هەر سزایەكی تر بوایە، هەرچەندە توندیش بوایە، ئەم چانسەی هەر بۆ دەهێڵایەوە، بەڵام سزای مەرگ هیچ چانسێكی بۆ نەهێڵایەوە.

رەنگە بوترێ ئەم رووداوە دەگمەنە، بەڵام خۆ ژیانی ئەو خەڵكەش دەگمەنە. ئەوەی روویداوە نزیكە لێمان، دە كاژێر بە فرۆكە دوورە لێمان. بێنەوایی (ئابوت) هێندە هەواڵێكی بچوكی نێوی تێكڕای هەواڵەكانە هێندە دەگمەن نییە، ئەگەر باوەڕ بە رۆژنامەكانمان بكەین دەبێ بزانین كە هەڵەیەكی دوورەپەرێز نییە. بەهەرحاڵ، یاساناس (ئۆلیڤكروا) كاتێ هەژماری گریمانەكانی لەساڵی ١٨٦٠ پەیڕوكرد، گەشتە ئەو دەرئەنجامەی كە ئەگەری هەڵەكردن هەیە لە بڕیاری دادگادا، بەپێی قسەی ئەو بێت: لەنێو هەموو دوو سەدو پەنجاو حەوت سزادراوێكدا بێتاوانێكی تێدایە. ئایا ئەم رێژەیە كەمە؟ رێژەیەكی كەمە بۆ سزا مامناوەندیەكان، بەڵام رێژەیەكی بێكۆتایە بۆ سزاكانی مەرگ. كاتێكیش (هیگۆ) دەنووسێت قەنارە لە تێڕوانینی ئەوەوە لۆزیركە[22]، مەبەستی ئەوە نییە هەموو ئەو سزادراوانەی ملیان لەلاشەیان دەكرێتەوە لۆزیرك بن، مەبەستی ئەوەیە تەنها

---

[22] لۆزیرك: ناوی سزادراوێكی بێتاوانە كە لە كەیسی (برید لیۆن)ـدا بە قەنارە سەری لەلاشەی كرایەوە.

لۆزیرکێك بەسە بۆئەوەی هەتایە ناوبانگت خراپکات. دەبێت تێبگەین لەوەی کە بەلجیکا لەپاش ئەوەی بەهەڵە بڕیاری سزایەکی لەسێدارەدانی دەرکرد، چیدی دەستی هەڵگرت لە سزای مەرگ، ئینگلترایش لەپاش کەیسی (هایز)ـەوە پرسی لابردنی سزای لەسێدارەدان تاوتوێ دەکات. دەبێ لەو داواکارە گشتیەش تێبگەین کە لەبارەی داواکاری لێبوردنی تاوانبارێکەوە راوێژی پێکراوە کە خەریکبووە تاوانەکە بەسەریدا ساغ بێتەوە ئەگەرچی قوربانیەکەش نەدۆزراوەتەوە، داواکارە گشتیەکەش لەمبارەیەوە نووسیویەتی: "مانەوەی (س) بە زیندوی رێگە خۆشکەرە لەبەردەم دەسەڵاتدا تا بتوانێت بەهێواشی بەشوێن هەر بەڵگەیەکی نوێدا بگەڕێت کە بیسەلمێنێت ژنەکەی لە ژیاندا ماوە[23]، بەڵام ئەگەر لەسێدارە بدرێت ئەوا دەرگا لەسەر هەموو جۆرە بەدواداچوونێك دادەخرێت و ئەگەری پەشیمانیەك دروست دەکات کە پێویست بە دروستکردنی ناکات". لەم پەیڤەدا پەرۆشی بۆ بەدەستهێنانی راستی و دادگەری بەدی دەکەین، هەقی خۆیەتی لە هەموو دادگاییەکانماندا باسی ئەم "ئەگەری پەشیمانی"ـیە بکەین کە پوختەی مەترسیەکە رووبەرووی هەموو ئەندامێکی ئەنجومەنی سوێند خواردن دەبێتەوە. لە راستیدا گەر

---

[23] سزادراو بەوە تاوانبار کرابوو کە ژنەکەی کوشتوە، بەڵام تەرمی ژنەکەی دیار نەبوو.

بێتاوانێك بمرێت، هیچ کەس ناتوانێت هیچ شتێکی بۆ بگێڕێتەوە، تەنها دەکرێت بایەخی بۆ بگێڕدرێتەوە. ئەوکات بێتاوانی دەخرێتەوە پاڵی، بێتاوانییەك کە لە راستیدا هەرگیز لەدەستی نەداوە، بەڵام ئەو لەسێدارەدانەی کە بوو بە قوربانی، لەگەڵ ئازارە سامناك و مەرگە تۆقێنەرەکەیدا دەبنە دەسکەوت گەلێکی هەتاهەتایی. ئیتر تەنها ئەوەمان لەدەست دێت بیر لە بێتاوانەکانی ئایندە بکەینەوە، کە چۆن لەم جۆرە ئازارانە بەدور بن. لە بەلجیکا بیر لەمە کرایەوەو جێبەجێشکرا، بەڵام وادیارە لە وڵاتی ئێمە وژیدانەکان گەلێك ئاسودەن.

وادیارە بۆیە ئاسودەیە چونکە پێی وایە کە داد پێشکەوتنی باشی بەخۆوە بینیوەو هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ زانستدا پێشکەوتوە. چونکە کاتێ لە دادگای تاوانەکاندا پسپۆڕێك قسە دەکات، وادێتە پێش چاو قەشەیەك قسە دەکات، یەکسەری ئەندامانی ئەنجومەنی سوێندخۆران کە بە ئاینی زانست گۆشکراون رەزامەندی لەسەر بۆچوونەکەی دەردەبڕن. نوێترین دادگایی و گرنگترینیان کەیسەکەی (بینار) بوو، بیرۆکەیەکی باشی پێداین دەربارەی قۆشمەچێتی پسپۆڕان. باشترین رێگا بۆ سەلماندنی تاوان لە رێگای پسپۆڕەکانەوەیە، پسپۆڕێك شتێك دەڵێت، پسپۆڕێکی تر شتێکی تر دەڵێت، بەو جۆرە

ئەو هاوکێشە کەسێتیە بەتێکڕای گرنگیەکانیەوە لەم ماتماتیکە مەترسیدارەدا دەمێنێتەوە. ڕێژەی زانا پسپۆڕەکان هێندەی ڕێژەی دادەوەرە دەروونزانەکانە، نەختێك لە ڕێژەی ئەندامە سوێندخۆرە جددی و بابەتیەکانیش زیاترە. ئیدی ئەمڕۆش ئەگەری ڕوودانی هەڵە وەك ئەوەی دوێنێ لەئارادایە. بەیانیش چەند پسپۆڕێکی تر بڕیاری بێتاوانی لەسەر ئابوتێکی تر دەدەن، بەڵام کاتێ فریا دەکەون ئەم ئابوتەش مردوە. ئەو زانستەش کە واخۆی دەردەخات کە وەك چۆن دەتوانێت تاوانکاری بسەلمێنێت هەروەهاش دەتوانێت بێتاوانی بسەلمێنێت، هێشتا پێڕانەگەشتوە کەسانێك بنێرێت بۆ کوشتنیان.

لەنێوان خودی تاوانبارانیشدا، ئایا دەتوانین دڵنیابین لەوەی تەنها ئەوانەمان لێ لەسێدارە داون کە بەکەڵکی چاکسازی نەماون؟ هەموو ئەو کەسانەی کە وەك من بە بۆنەی پێویستیەکەوە، لە قۆناغێکی ژیانیاندا بەدواداچوونیان بۆ دۆسیەکانی تاوان کردوە، باش دەزانن کە هەڵکەوتی زۆر تێکەڵ بە بڕیارەکانی دادگا دەبێت، تەنانەت ئەگەر بڕیارەکانیش بڕیاری مەرگ بن. سەری تاوانبار (زۆرجار داوێن پیسی هێندەی تر تاوانەکە لەلای ئەنجومەنی سوێندخۆران قێزەونتر دەکات، کە من بۆخۆم تائێستا نەمتوانیوە باوەڕ بەوە بێنم ئەوان خۆیشیان دڵسۆزبن بۆ هاوسەرەکانیان)، شێوازی ڕاوەستانی (کە هیچ

وەختێ لە بەرژەوەندیدا نییە مەگەر بەشێوازێکی کۆمیدیانە وەستابێت)، شێوازی قسەکردنی (تاوانبارە هەمیشەییەکان دەزانن کە نابێ لەکاتی قسەکردندا منجەمنج بکەن و ناشبێ بە شێوازێکی جوان و لێزانانە قسەبکرێ)، رووداوەکانی تری دانیشتنەکە کە سۆزداریانە مەزەنە دەکرێت (کە لە راستیدا بەداخەوە هەمیشە کاریگەر نین) لەگەڵ چەندین هەڵکەوتی تردا، کاریگەریان هەیە لەسەر بڕیاری کۆتایی ئەنجومەنی سوێندخۆران. لەساتی جاڕدانی بڕیاری مەرگیشدا، دڵنیاین لەوەی کە دەبوایە بگەیباین بە سزایەکی دڵنیاتر. کاتێك دەزانین بڕیاری مەرگ پەیوەستە بە هەڵسەنگاندنێك کە ئەنجومەنی سوێندخۆران ئەنجامی دەدەن، بەتایبەت کاتێ دەزانین کە هەمواری ١٨٣٢ دەسەڵاتی بێسنوری داوە بە ئەنجومەنی سوێندخۆران لە دیاریکردنی بڕیارەکان، ئەوجا دەتوانین وێنای ئەو ئازادیە بکەین کە لەبەردەم میزاجی ئەندامانی ئەنجومەنی سوێندخۆراندا هەیە. یاسایەك نییە بە وردی بڕیار لەسەر ئەو کەیسانە بدات کە تایبەتن بە بڕیاری لەسێدارەدان، بەڵکو ئەوە ئەنجومەنی سوێندخۆرانن کە مەزەنەی سزادراو دەکەن و بڕیار لەمبارەوە ئەدەن. جا ئەگەر دوو ئەنجومەنی سوێندخۆران چاوخشاندن بۆ بڕیارێکی لەسێدارەدان بکەن رەنگە بە بڕیاری یەکیان جێبەجێ بکرێت و بە بڕیاری ئەوی دیکەیان جێبەجێ

نەکرێت. چونکە ئەگەر بە بۆچوونی دانیشتوانی ئابرومەندی شارۆچکەیەکیان تاوانبار بێت و بەکەڵکی چاکسازی نەیەت، رەنگە لە شارۆچکەیەکی تر پاساوێکی بۆ بدۆزنەوە. بەڵام بەدبەختانە ریزەکە دەچێتەوە سەر هەردوو شارۆچکەکەو هیچ جیاوازیەك ناکات. هەڵکەوتەکانی کات تێکەڵ بە هەڵکەوتە جوگرافیەکان دەبێت و گاڵتەجاڕیتی گشتی بێ پشت ئەستورتر دەبێ. کرێکارێکی کۆمۆنیستی فەرەنسی لە جەزائیر بە قەنارە لەسێدارە درا، لەبەر ئەوەی بۆمبێکی (پێش ئەوەی بتەقێتەوە دۆزیبوویانەوە) خستبووە نێو ژووری خۆگۆڕینی یەکێك لە کارگەکانەوە، بەهۆی ئەم کارەی و لەبەر ئەو کەشەی وڵات پێیدا تێدەپەڕی، سزای ملپەڕاندنی بەسەردا سەپێنرا. لە رێگەی ئەو کەشەی جەزائیرەوە دەیانویست بۆ رای گشتی عەرەبی بسەلمێنن کە قەنارە تەنانەت بۆ خودی فەرەنسیەکانیش لە ئارادایە، هاوکات رای گشتی فەرەنسیش کە تورەی دەستی تاوانەکانی تیرۆرە، رازی کەن. لەمیانی ئەمەشدا، ئەو وەزیرەی کە ئەم پرۆسەیەی دەپاراست، لە فەرمانگەکەی خۆیدا بەری بە دەنگی کۆمۆنیستەکان دەگرت. ئەگەر دۆخەکە بەمشێوەیە نەبوایە کە باسمان کرد ئەوا تاوانبار رزگاری دەبوو، رەنگە رۆژێك لە رۆژانیش، گەر ببوایە بە نوێنەری حیزب، لەسەر هەمان مێزی جەنابی وەزیر مەیی

بنۆشیایە. ئەم جۆرە بیرۆکانە گەلێك تاڵن، بریا هەردەم بە زیندوویی لە مێشکی دادوەرەکانماندا بمانایەتەوە. دەبێ بزانن نەریت و سەودەم بەردەوام لە گۆڕاندان، ڕۆژێکیش دێ ئەو تاوانبارەی کە زۆر بەزووی لەسێدارە درا، بەو دڕندەییەی ئێستا نایەتە پێش چاو. بەڵام ئەوکات هەموو شتێك لەدەستچوەو بوار نەماوەتەوە بۆ پەشیمانی و لەبیرچوونەوە. بێگومان ئەوان لەبیریان دەچێتەوە، بەڵام ئەو زیانەی بە کۆمەڵگایان گەیاندوە هەرگیز خۆش نابێتەوە. یۆنانیەکان پێیانوابوو تاوانێك سزای لەسەر نەدرێت گەندەڵی بەنێو کۆمەڵگادا پەخش دەکات، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات، بێتاوانی بەتاوانبارکراو، یان تاوانێك کە زێدەڕەوی لەسزادانیا کرابێت، بەهەمان چەشن کۆمەڵگا گلاو دەکات. ئێمەش لە فەرەنسا ئەم ڕاستیە باش دەزانین.

پێدەچێ بوترێ: ئەمەیە دادپەروەری مرۆیی، بۆ بەڵاو ئافاتەکانمان ئەمە باشترە تا ستەمکاری. بەڵام ئەم بۆچوونە خەمۆکاویە تەنها لەهەمبەر سزا ئاساییەکان قبوڵ دەکرێت، لەهەمبەر بڕیارەکانی ملپەڕاندندا بۆچوونێکی ئابڕوبەرە. لە نێو یاسا فەرەنسیەکاندا و لە نووسراوێکی کلاسیکیدا پاساو هێنراوەتەوە بۆ نەبوونی پلەبەندی لە سزای مەرگدا، تێیدا هاتووە دەڵێت: "دادپەروەری مرۆیی هەرگیز چاو لە دووی ئەوە نییە ئەم ڕێژەییە دابین بکات، بۆچی؟ چونکە دەزانێت

هەرزەیە". کەواتە ئایا دەبێت بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەم هەرزەییە ڕێگەمان پێدەدات بڕیاری ڕەها بدەین، ئایا دەکرێت بڵێین کۆمەڵگا مادام دڵنیا نییە لە بەدیهێنانی دادپەروەری پوخت و بێگەرد ئیتر دەبێ بەخێرایی خۆی فڕێداتە نێو گەورەترین مەترسی و ستەمی ڕەهاوە؟ وەگەر دادپەروەری دەزانێت بێتوانایە، باشتر نییە بە وێنەیەکی لەخۆبوردانەترەوە خۆی دەرخات و لەدەوری بڕیارەکانیدا پەراوێزێك بهێڵێتەوە تا لە ڕێگەیەوە بتوانرێت هەڵە گریمانەکراوەکان چاك بکرێتەوە؟[24] هەر ئەم لاوازییە کە هەردەم ڕێگەی پێدەدات ئاسانکاری بۆخۆی بدۆزێتەوە، ئایا نابێت ئەم ئاسانکارییە بۆ تاوانبار دابین بکات؟ ئایا ئەندامانی ئەنجومەنی سوێندخۆران دەتوانن ئابڕومەندانە بڵێن: "ئەگەر بە هەڵە تۆمان کوشت، لەبەر ئەو لاوازییەی لە سروشتی هاوبەشماندا هەیە لێمان دەبوریت. بەڵام ئێمە بڕیاری مەرگ بەسەر تۆدا دەسەپێنین بێئەوەی ڕەچاوی ئەم لاوازی و ئەم سروشتە بکەین". کۆدەنگیەك لەنێو سەرجەم مرۆڤەکاندا بوونی هەیە لە مەڕ هەڵەو خراپەکارییەکان، ئایا دەکرێ دادگا ئەم کۆدەنگیە

(24) دادوەرەکان پیرۆزباییان لە خۆیان دەکرد کەوا توانیویانە (سیلۆن) ببەخشن کە منداڵە تەمەن چوار ساڵانەکەی خۆیی کوشتوە، چونکە نەیویستوە بیدات بە ژنەکەی کە داوای تەڵاقی لێکردوە. ئیتر لەکاتی بەندکردنیدا بۆیان دەردەکەوێت کە (سیلۆن) گرێیەك لە مێشکیدا هەیەو ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێت ئەو کارە شێتانەی کردوە.

لەبەرژەوەندی خۆی بەکاربێنێت و تاوانباری لێ بێبەری بکات؟[25] نەخێر. وەگەر دادپەروەری لەم جیهانەدا مانایەکی هەبێت، ئەوا تەنها دانانە بەم کۆدەنگیە. ئەمەش بەهۆی پێکهاتەکەیەوە ناتوانرێت لە بەزەیی جیابکرێتەوە. بێگومان لێرەدا بەزەیی تەنها هەستکردنە بە ئازاری هاوبەش، نەك لێبوردنێکی پڕوپوچانە کە هیچ وەخت نە ئازارەکانی قوربانی و نە مافەکانی لەبەرچاو ناگرێت. ئەو سزا بەدور ناگرێت، بەڵام سزای مەرگ هەڵدەپەسێرێت. ئەو ڕێوشوێنە کۆتاییە هەڵدەپەسێرێت کە گەڕانەوە لێی مەحاڵەو ستەم لە سەرتاپای مرۆڤ دەکات، مادام بێنەوایی چارەنووسی هاوبەش لەبەرچاو ناگرێت.

لە ڕاستیدا بەشێك لە ئەندامانی ئەنجومەنی سوێندخۆران ئەمە باش دەزانن، بۆیە زۆرجار ئاسانکاری لە کەیسی تاوانێکدا دەکەن کە هیچ شتێك ناتوانێت ئاسانکاری تیابکات. بۆ هەندێك لەو کەیسانە پێیانوایە سزای مەرگ زیادەڕەوییە، بۆیە پێیان باشترە سزاکە کەمتر بێت وەك لەوەی زیادەڕەوی تێدا بکرێت. ئەوکات زەبرو زەنگی سزای مەرگ لەبری ئەوەی بەر بە تاوان بگرێت هێندەی تر هانی تاوانکاری دەدات. هەرجارێك دادگای تاوان دانیشتنێك دەبەسێت، لە ڕۆژنامەکانماندا هەواڵێکی لەم شێوە دەخوێنینەوە کە دەڵێت

---

(25) واتە: ئایا دەکرێت دادگا بڵێت مادام مرۆڤەکان هەڵە دەکەن ئاسایە منیش بکەومە هەڵەوە، بەڵام بەتاوانبار بڵێت تۆ نەدەبوا هەڵە بکەیت، مادام هەڵەت کردوە دەبێ سزا بدرێیت؟ (وەرگێڕی کوردی)

بڕیارەکە نەگونجاوبوو، وادیاربوو بەڵگەکان کەموکورتی یان زیادەڕەویان تێدابوو. بەڵام ئەنجومەنی سوێندخۆران بێئاگانین لەمە، بەڵکو دەیانەوێت لەهەمبەر گەورەیی سزای مەرگ لەبری ئەوەی شەوانی داهاتوویان تێوەگلێنن، بە روخسارێکی سەرسامەوە خۆیان نیشان ئەدەن، خۆ ئەگەر ئێمە لەجێی ئەوان بوینایە وەهامان دەکرد. ئەوان کە خۆیان بە هەرزە دەزانن، لانیکەم ئەنجامە گونجاوەکان پالفتە دەکەن. ئیدی چەندە لۆژیك پاڵپشتیان نەبێت هێندە دادپەروەری راستەقینە لەگەڵیانە.

هەندێ تاوانباری گەورەش هەن ئەنجومەنی سوێندخۆران لە هیچ سات و شوێنێکدا ئاسانکاری ناکات لە سزادانیان. گومان لە تاوانەکانیاندا نییەو ئەو بەڵگانەش کە دەخرێنەروو دەدرێنە پاڵ دانپیانانەکانی لایەنی بەرگریکار، گومان لەوەشدا نییە کە ئەو لادان و وەحشیگەریەی تێیاندایە دەیانخاتە ریزی تاوانبارە ناساخ و بیمارەکانەوە. پسپۆڕە دەروونیەکانیش لە زۆربەی دۆخەکاندا بەرپرسیارێتی خۆیان دووپات دەکەنەوە. ماوەیەك لەمەوپێش لە پاریس، گەنجێك کە خاوەنی کەسایەتیەکی لاواز دەبێت، بەڵام خۆشەویست و هۆگری کەسوکاری دەبێت، لەبەرئەوەی کە درەنگ گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە، باوکی قسەیەکی ناخۆشی پێدەڵێت و ئەمیش تورە دەبێت. باوکی

بەرامبەر مێزی چێشتخانە دانیشتووەو دەخوێنێتەوە، کوڕەکە تەورێك هەڵدەگرێت و لەدواوە چەند گورزێکی کوشندەی لێدەدات، پاشان بەهەمان شێوە هەڵدەکوتێتە سەر دایکی کە لە چێشتخانەکەدایە. ئینجا جلەکانی دادەکەنێت و پانتۆڵە خوێناویەکەی لە جەکمەجێکدا دەشارێتەوە، پاشان دەچێت بۆ سەردانی کەسوکاری دەزگیرانەکەی، بێ ئەوەی شتێك جێبێڵێت لەسەری بکەوێت، دواتر دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو هەواڵ بە پۆلیس دەدات و دەڵێت کاتێ گەڕاومەتەوە هەروا بە کوژراوی دۆزیونمەتەوە. هێندە نابات پۆلیس پانتۆڵە خوێناویەکە دەدۆزنەوە، ئینجا بێ هیچ پێچ و پلۆچێ بەئارامی دان بە تاوانەکەیدا دەنێت. پزیشکە دەروونناسەکان بەرپرسیارێتی ئەم تاوانەیان گێڕایەوە بۆ تۆڕەیی و پیشخواردنەوەی بکوژەکە. بەڵام ئەو بێباکیە سەیرو سەمەرەی لە بەندیخانەدا نیشانیداوە هەرگیز بە شتێکی سروشتی دانانرێت (کاتێ قسەی لەگەڵ پارێزەرەکەی کردوە دڵخۆشی خۆیی داوەتەوە کەوا خەڵکێکی زۆر لە پرسەی دایك و باوکیدا ئامادەبوون و وتویەتی: بە راستی لەلای هەموان خۆشەویست بوون). بەڵام وادیاربوو ئەقڵی ساغ و سەلامەت بوو.

زۆرێك لە "دڕندەکان" بە روخسارێکەوە دەردەکەون کە ناتوانرێت ئەودیوی ببینرێت. هەر کە بەڵگەکان لەسەریان ساغ دەبێتەوە

لەسێدارە دەدرێن. دیارە سروشت و گەورەیی تاوانەکانیان ڕێگە بەکەس نادات وێنای ئەوەبکات کە دەتوانن تۆبە بکەن و چیدی تاوان نەکەن. کەواتە تەنها دەبێت وریابین لەوەی دووبارە تاوان ئەنجام نەدەنەوە، هیچ چارەسەرێکیشیان نییە سڕینەوەیان نەبێت. تەنها لەسەر ئاستی ئەم جۆرە تاوانبارانە دەشێ قسەکردن لەبارەی سزای مەرگەوە ڕێگەپێدراو بێت. ئیتر لە هەموو حاڵەتەکانی تردا، بیانووەکانی پارێزگاران ناتوانێت خۆڕاگر بێت لەبەرامبەر ڕەخنەی لایەنگرانی لابردنی سزای لەسێدارەدان. هەر تایبەت بەم بوارەش، بە ڕەچاوکردنی ئەو نەزانیەی تێیدا دەژین، ناچارین بچینە نێو سەرکێشییەکەوە. چونکە هیچ ڕووداو و هیچ بیرکردنەوەیەك نییە هەق بدات بە لایەنێك: لایەنێك کە پێیوایە دەبێ چانس بدرێت بە مرۆڤە هەرچی و پەرچیەکان، لایەنێکی دیکەش پێیوایە چانسێکی وەها بێهودەیە. بەڵام ڕەنگە بتوانین لەم سنورەی دواییدا دەستبەرداری ئەم پێکداهەڵپژانە دورو درێژەی نێوان لایەنگرانی سزای مەرگ و دژبەرانی ببین، ئەگەر بێینو مەزەنەیەك بۆ سودی ئەم سزایە بکەین کە ئەمڕۆکە لە ئەورووپادا هەیەتی. ئێستا من هەوڵەدەم کەمێك لێهاتوانە ئاواتی مافناسی سویسری مامۆستا (جان گرافان) بەدیبێنم، کە لەساڵی ١٩٥٢ لە توێژینەوەیەکی شیاودا سەبارەت بە سزای مەرگ

نووسیویەتی: "سەبارەت بەو کێشەی کە لەمەودوا لە ویژدان و ئەقڵماندا خۆی دەخاتەروو، پێمانوایە کە بۆ دۆزینەوەی چارەسەر نابێ لە چەمکەکانی رابردوودا و لەنێو کێشەو پاساوەکانیدا بگەڕێین، ناشکرێ لەنێو هیواکانی ئایندەو بەڵێنە تیوریەکانیدا بگەڕێین، بەڵکو دەبێ لە بیرۆکەو پێدراوە هەنوکەیەکاندا بۆی بگەڕێین"[26]. بێگومان دەتوانین هەتاهەتایە مشتومڕ لەسەر چاکەو خراپەکانی سزای ملپەڕاندن بکەین کە بەدرێژایی چەندین سەدە هەیبووە، بەڵام ئێستا رۆڵێکی پەژمووردەو خراپی هەیە، ئیتر دەبێ هەر ئێستاو هەر لێرەش هەڵوێستی خۆمان دیاریکەین بەرامبەر بە جەللادی هاوچەرخ. سزای ملپەڕاندن بە واتای چی دێت لەلای مرۆڤی ئەم نیوە سەدەیە؟

بۆ ئاسانکاری بابڵێین شارستانیەتمان ئەو بەهایانەی لەدەستداوە کە تا رادەیەك دەتوانێت ئەم سزایە بەهانەدار بکات. بە واتایەکی تر، لابردنی سزای لەسێدارەدان دەبێ ئەندامە هوشیارەکانی کۆمەڵگا داوای بکەن، هەڵبەتە ئەمەش لەیەك کاتدا هۆکاری لۆژیکی و واقیعی خۆیی هەیە.

با یەکەم جار باس لە لایەنە لۆژیکیەکەی بکەین: گریمان واپێویست دەکات سزای مەرگ بەسەر پیاوێکدا بسەپێنرێت، واتە بڕیار دەدەین

(26) گۆڤاری زانستی تاوانکاری و پۆلیسی هونەری، جینێف، ژمارەیەکی تایبەت، ١٩٥٢.

کە ئەم پیاوە چیدی بەختی بیرکردنەوەی نەمێنێت. لەسەر ئەم خاڵەش پاساوەکان بەتێکەڵ رووبەرروی یەکتر دەبنەوەو لە دژبەرییەکی نەزۆکدا وردو خاش دەبن. بەڵام هیچ کەسمان ناتوانین لەمبارەیەوە بۆچوونێکی یەکلاکەرەوە بخەینەروو، چونکە هەردوولا لەیەك کاتدا دژبەری یەکدین و دادوەریشین بەسەر یەکتردا. ئا لەبەر ئەمەیە کە دڵنیانین لەوەی ئایا هەقمان هەیە سزای مەرگ بەسەر وەها خەڵکێکدا جێبەجێکەین یان نا، هەر لەبەر ئەمەیە کە تا ئێستا نەمانتوانیوە لایەنێکمان لایەنەکەی ترمان رازیکات. چونکە بەبێ بێتاوانی رەها، دادپەروەری دادوەرێکی رەهای نییە. راستیەکەی هەموومان کاری خراپمان لە ژیانماندا ئەنجامداوە، ئەم خراپەکاریە رەنگە گەشتبێتە ئاستی تاوانیش بەڵام کەسی تر پێی نەزانیوەو نەکەوتۆتە ژێر مێزی یاساوە. کەوابێ دادگەرێك لە جیهاندا بوونی نییە، ئەوەی کە هەیە جیاوازی رێژەی دادگەرییە، کەسانێك هەن هەژارن لە دادگەریداو کەسانێك هەن هەژارترن. ژیان لانیکەم رێگەمان پێدەدات ئەم راستیە بزانین، دەرفەتی ئەوەشمان پێدەدات کە نەختێك چاکەکاری سەرباری کۆی گشتی کارەکانمان بکەین، تا لانیکەم ئەگەر کەمێکیش بێت، قەرەبووی ئەو خراپەکاریەی پێبکەینەوە کە بەسەر جیهاندا هێناومانە. ئەم مافەی ژیان کە لەگەڵ

توانای بیرکردنەوەدا دێتەوە، مافی سروشتی هەموو مرۆڤێکە، تەنانەت ئەگەر مرۆڤێکی هەرچی و پەرچیش بێت. خوێڕیترین تاوانبارو دەستپاکترین دادوەر لەم مافەدا وەك یەکن، ژیانی رەوشتییش بەبێ ئەم مافە ئەستەمە. هیچ کەس لە ئێمەش مافی ئەوەمان نییە لە تاکە کەسێکی تر نائومێد بین، تەنها لەدوای مەرگی نەبێت، ئەوکات بۆمان هەیە بڕیاری کۆتایی لەبارەوە بدەین. بەڵام بۆمان نییە بڕیاری کۆتایی پێش مەرگی خۆی بدەین و ژمێرەی بۆ ئەنجام بدەین لەکاتێکدا قەرزارەکە خۆی هێشتا لەژیاندا ماوە، چونکە ئەمە مافی هیچ مرۆڤێك نییە. هەرکەسێك بڕیارێکی رەها بدات ئەوا رەهایانە خۆی تاوانبار دەکات.

(برنار ڤالو) کە یەکێکە لە ئەندامانی باندی (مازوی) و بەکرێگیراوی (گستاپۆ)ـیە، مەبەستم لەو (گستاپۆ)ـیە کە لەپاش ئەنجامدانی چەندین تاوانی سامناك سزای ملپەڕاندنی بەسەردا دراو بەشێوەیەکی دلێرانە گیانی لەدەستدا، (برنار) وتویەتی کە هەرگیز نابێ ببەخشن، بە هاوزیندانیەکی خۆیی وتوە: "دەستم سورە بەخوێنی چەندین کەس"[27]. بێگومان رای گشتی و رای دادوەرەکانی خستویانەتە ریزی ئەو کەسانەی کە بەکەڵکی چاکسازی نەماون، منیش بەمە

---

[27] جان بۆکۆنیانۆ لە کتێبی (گەڕەکی دڕندەکان، گرتوخانەی فرین).

رازی دەبووم گەر ئەم شایەتیە سەیرەم نەخوێندایەتەوە. بزانن چی بەم هاوزیندانیەی خۆی وتوە، پاش ئەوەی رایەگەیاندوە کە دەیەوێت دلێرانە بمرێت: "دەتەوێت بزانیت من چەندە پەشیمانم، باشە! من پەشیمانم لەوەی تا ئێستا ئاشنا نەبووم بە کتێبی پیرۆز کە ئێستا لێرە لەبەردەستمە. دڵنیات دەکەمەوە گەر زووتر بەم کتێبە ئاشنا بوومایە نەدەگەشتمە ئەم دۆخەی ئێستا". لێرەدا مەبەستم ئەوە کۆمەڵێك وێنەی باو نیشاندەم و ئەو سزادراوانە بەبیربێنمەوە کە لە کانگەکاندا قورسترین کاریان پێدەکەن، ئەوانەی (ڤیکتۆر هیگۆ) لە رۆمانەکانیدا دڵپاکیانی نیشانداین. سەردەمی رۆشنگەری، وەك دەوترێ، دەیویست سزای مەرگ نەهێڵێت، بەبیانوی ئەوەی مرۆڤ لە کرۆکدا چاکەکارە. بێگومان وەهاش نییە (یان چاکترە یان خراپترە). ئێمەش لەپاش بیست ساڵ لە لەم مێژووە مەزنەمان ئەم راستیە دەزانین. بەڵام لەبەر ئەوەی وەهاش نییە، مرۆڤ ناتوانێت ئاستی خۆی نزمکاتەوە بۆ ئاستی دادوەری رەهاو بڕیار لەسەر بوونی هیچوپوچ ترین تاوانبار بدات، چونکە کەسمان ناتوانین بانگەشەی بێتاوانی رەها بکەین. بڕیاری سزای ملپەڕاندن ئەو کۆدەنگیە مرۆییە تێکدەشکێنێت کە هیچ مشتومڕێك هەڵناگرێت، کە کۆدەنگیە دژی مەرگ، رەوایەتیشی

تەنها لە ڕێگەی ڕاستیەك یان پرنیسپێکەوەیە کە خۆی دەخاتە سەرو مرۆڤەوە.
لە ڕاستیدا لەوەتەی هەبووە سزای مەرگ سزایەکی ئایینی بووە، بەناوی پادشاوە ئەو جۆرە فەرمانە دەرکراوە کە نوێنەری خودا بووە لەسەر زەوی، یان بەناوی زەیوانەوە دەرکراوە، یان بەناوی کۆمەڵەیەکەوە کە بەدەستەیەکی پیرۆز دانراون. سزای مەرگ لەوکاتدا کۆدەنگی مرۆیی تێك نەدەشکاند، بەڵکو پەیوەستی تاوانباری بە کۆمەڵگای خواوەندیەوە تێکدەشکاند، کە تەنها شتێك بوو دەیتوانی ژیانی بێبەخشێت. گومان لەوەدا نەبوو کە ژیانی سەر زەمینی لێدەسەنرایەوە، بەڵام مافی ئەوەیان پێدەدا داوای بەخشین بۆ ئەو دونیا بکات. ئەمە هێشتا بڕیاری ڕاستەقینەی بۆ دەرنەچووبوو، بڕیاری ڕاستەقینە لەو دونیا دەردەچێ. کەواتە بەها ئاینیەکان و لایەندارێتی باوەڕ بۆ ژیانی هەتاهەتایی، تاکە بەهایەکن کە دەتوانرێت سزای مەرگی لەسەر هەڵچنرێت، چونکە بە پێی لۆژیکی خۆی مالئاوایی کۆتایی نییە کە گەڕانەوە لێی مەحاڵ بێت. ئیدی ئەوکات چەندە کۆتایە هێندە بەهانەدارە.
کڵێسای کاسۆلیکی هەمیشە سزای مەرگی بە پێویست زانیوە، لەسەردەمانی ڕابردووشدا هەر خۆی بڕیاری سزای لەسێدارەدانی

دەردەکرد، ئێستاش هەر بە پێویستی دەزانێت و پاساوی بۆ دەهێنێتەوەو رەوایەتی بەدەولەت ئەدات لە جێبەجێکردنیدا. لەساڵی ۱۹۳۷ـدا بەڕێز (گران) راوێژکاری نەتەوەیی سویسری لە (فریبۆرگ)، لەمیانی مشتومڕێکدا لە ئەنجومەنی نەتەوەیی دەربارەی سزای مەرگ، پێیوایە خراپترین تاوانباریش لەپێش جێبەجێکردنی سزاکە خۆی رادێنێت، ئەو دەڵێت: "تاوانبارەکە تۆبە دەکات، ئیتر بەمشێوە بەئاسانی دەتوانێت ئامادە بێت بۆ مردن. کلێسا یەکێك لە ئەندامەکانی خۆیی رزگار کردو پەیامی یەزدانیی بەجێگەیاند، بۆیە هەمیشە بە سزای مەرگ رازی بووم، نەك تەنها وەك ئامرازێکی رێگەپێدراو، بەڵکو وەك ئامرازێکی مەزن بۆ سەرفەرازبوون... بانگەشەی ئەوە ناکەین کە سزای مەرگ لە داهێنانی کلێسایە، بەڵام دەتوانین بڵێین ئەم سزایە کارتێکراوێکی نیمچە یەزدانیە، هەر وەکو جەنگ". هەرچەندە ئەم هەڵوێستەی خوێندنەوەی جیاجیا هەڵدەگرێت، بەڵام بە راستی هەستێکی قوڵی تیا بەدی دەکرێت!

هەر بە پشت بەستن بەم بیرۆکەیە، دەتوانین باشتر لەو دەستەواژەیە تێبگەین کە لەسەر شمشێری جەللادەکەی (فریبۆرگ) نووسراوە: "ئەی خودای مەسیح، تۆ دادوەریت". ئیتر جەللادەکە پێیوایە خەریکی پیشەیەکی پیرۆزە، چونکە ئەو پیاوەیە کە جەستە

تێکدەشکێنێت و رۆح دەداتە دەستی بڕیاری خوایی، بڕیارێك کە هیچ مرۆڤێك بیرۆکەیەکی پێشوەختی لەبارەوە نییە. رەنگە خوێنەرانیش پێیانوابێت ئەو جۆرە دەستەواژانە پێکداهەڵپژانی نەخوازراو بەدوای خۆیاندا دێنن، بێگومان ئەو شمشێرە لە دیدی ئەو کەسانەی پەیڕەوی فێرکاریەکانی مەسیح دەکەن سوکایەتیەکی ترە بۆسەر خودی مەسیح. لەژێر ئەم رۆشنایەشدا دەتوانین لەو قسە ترسناکە تێبگەین کە لەساڵی ١٩٠٥ـدا سزادراوێکی روسی پێش ئەوەی جەللادەکانی قەیسەر لەسێدارەی بدەن، بەرەو رووی ئەو قەشەیە درکاندی کە دەیویست بە وێنەی مەسیح دڵیداتەوە، وتی: "خۆت بەدوور بگرەو پیرۆزیەکان پێشێل مەکە". ئەوانەشی کە باوەڕدار نین ناتوانن رێ لە خۆیان بگرن و بیر لەوە نەکەنەوە کە ئەو کەسانەی باوەڕیان لەسەر بیرۆکەی قوربانی هەڵچنیوە، هەڵەیەکی یاسایی دەکەن گەر بێدەنگ بن لەئاست کوشتنی شەرعی. باوەڕداران بەبیردێنمەوە کە ئیمپراتۆر (جولیان) پێش ئەوەی بڕوا بە ئاینی مەسیحی بێنێت، رازی نەبوو پۆستی فەرمی بدات بە کریستیانەکان، چونکە ئەوکات کریستیانەکان هەرگیز لەگەڵ سزای لەسێدارەداندا نەبوون. کەواتە کریستیانەکان بەدرێژایی پێنج سەدە پێیانوابوو فێرکاری رەوشتی مامۆستاکەیان دژی کوشتنە. بەڵام رێباوەڕی

کاسۆلیکی تەنها لە خودی مەسیحەوە سودی وەرنەگرتوە، بەڵکو سودی لە (چاخی کۆن) و زەیوان (پۆڵس) و یەك بەیەکی قەشەکانی کڵێسا وەرگتووە. نەمری رۆح و زیندوبوونەوە دوو کۆڵەکەی سەرەکی رێباوەڕی کڵێسان، ئا لەم سۆنگەوەیە کە بەبۆچوونی مرۆڤی باوەڕدار سزای مەرگ سزایەکی کاتییەو سزای کۆتایی بەهەڵپەسێردراوی دەمێنێتەوە، بە تێڕوانینی مرۆڤی باوەڕدار رێوشوێنێکی پێویستە بۆ سیستەمی زەمینی و، گرتنەبەری رێگایەکی کارگێڕییە کە تاوانبار لەناونابات بەڵکو بەپێچەوانەوە رێگای بۆخۆش دەکات لەو دنیا سەرفەرازبێت. من ناڵێم سەرجەم باوەڕداران بەمشێوەیە بیردەکەنەوە، من پێموایە هەندێك لە کاسۆلیکەکان هەڵوێستیان لە مەسیحەوە نزیکترە وەك لە موسا یان قەشە پۆڵس. من تەنها دەمەوێت بڵێم باوەڕبوون بە نەمری رۆح رێگەی داوە بە کاسۆلیکەکان خوێندنەوەی جیاوازو پاساوی جیاجیا بۆ کێشەی سزای مەرگ بهێننەوە.

بەڵام ئەم پاساوانە چ مانایەکیان هەیە لەم کۆمەڵگەی ئێمەدا، کۆمەڵگەیەك کە هیچ پیرۆزییەك نە لە دامەزراوەکانیدا ماوەتەوەوە نە لە نەریتەکانیدا؟ کاتێ کە دادوەرێکی بێباوەڕ یان گومانگەرا یان چوزانم، بڕیاری سزای مەرگ لەسەر سزادراوێکی بێباوەڕ دەدات،

سزایەکی کۆتایی بەسەردا دەدات کە چیدی ناتوانرێت چاوی پیابخشێنرێتەوە. ئەو خۆی دەخاتە جێگەی خوا بێئەوەی تواناکانی خوای هەبێت(28)، یان بێئەوەی باوەڕی پێی هەبێت. پوختەی قسەکانم ئەوەیە، دادوەر بۆیە بڕیاری کوشتن دەدات چونکە باوباپیرانی بڕوایان بە ژیانی هەتاهەتایی ئەو دونیابووە، بەڵام ئەو کۆمەڵگایەی کە ئەم واخۆی دەردەخات نوێنەرایەتی دەکات، وشەگەلێك دەدرکێنێت کە خودی بوون هەڵدەقرچێنێت، ئەو کۆمەڵگا مرۆییەش تێکدەشکێنێت کە لەدژی مەرگ یەکیگرتووە، ئینجا خۆی دەخاتە ئاستی بەهایەکی رەهاوە چونکە بانگەشەی دەسەڵاتی رەها دەکات. پاشان وەك نەریتێکی داسەپیوو، قەشەیەك دەنێرێت بۆلای سزادراو. قەشەکەش بەهیوایە ترسی سزادراو لە سزاکە ببێتەهۆی ئەوەی تاوانبار پەشیمان بێتەوەو تۆبەبکات. بەڵام کێ رازی دەبێت بەوەی سزایەك کە لەلای هەندێ قبولکراوەو لەلای هەندێکی تر قبوڵنەکراوە، بە گیانێکی تەواو جیاوازەوە بەهانەدار بکرێت؟ باوەڕهێنان پێشی ترس شتێکەو باوەڕهێنان لەدوای ترس شتێکی ترە. باوەڕهێنان بە زەبری ئاگرو کارد هەردەم گوماناوییە. پێمانوابوو کڵێسا چیدی وازی لەوە هێناوە بەزەبری

---

(28) ئاشکرایە کاتێ ئەنجومەنی سوێندخۆران بڕیار دەدەن، هەمیشە بەم دەستەواژەیە دەست پێدەکەن: "لەبەردەم خوا و لە بەردەم ویژدانم"...

تۆقاندن بەسەر گومڕاکاندا سەرکەوێت. بەهەرحاڵ، کۆمەڵگایەك کە پیرۆزیی لەدەستدابێت ناتوانێت هیچ شتێکی لە باوەڕهێنان دەستکەوێت کە ئەو بۆخۆی بانگەشەی ئەوەدەکات ئەم باوەڕهێنانەی بەلاوە گرنگ نییە. ئەم کۆمەڵگایە سزایەکی داناوە کە هەر خۆی لەهەمان کاتدا بەهانەو کەڵکەکانی لێدابڕیوە. کاتێ بیر لەخۆی دەکاتەوە دەڵێی وڕێنە دەکات، بەهەموو هێزێکیەوە خراپەکاران لە پەرژینەکەی دەردەکات، وەکو وابێت خۆی چاکەکاربێت. وەك ئەو پیاوە بەڕێزەی لێهاتووە کە کوڕەکەی خۆی دەکوژێت چونکە لەڕێی ڕاست لایداوە، دەڵێت: "لە ڕاستیدا، چیدی نازانم چی لێبکەم". ئەم پیاوە بەڕێزە مافی هەڵبژاردن بەخۆی دەدات، وەکو وابێت خودی سروشتە، مافی ئەوە بەخۆی دەدات ئازاری بێسنور سەرباری لەسێدارەدان بکات، وەکو وابێت خوایەکی بەتوانایە.

بەهەرحاڵ، جەختکردنەوە لەوەی کە دەبێت مرۆڤ بە تەواوی لە کۆمەڵگا جیابکرێتەوە چونکە ئەو مرۆڤە زۆر شەڕەنگێزە، بەواتای ئەوە دێت کە ئەو کۆمەڵگا زۆر چاکەکارە، قسەیەکی وەها مرۆڤێکی ژیری ئەمڕۆ باوەڕی پێناکات. هیچ کەس بڕوا بە قسەی واناکات، بەڵکو بەئاسانی باوەڕ بە پێچەوانەکەی دەکرێت. کۆمەڵگای ئێمە بۆیە بەم ڕادەیە خراپ و تاوانبار بووە چونکە ئاستی خۆی نزم

کردۆتەوە بۆ ئاستی دوایین مەرام، وەها لێهاتوە کە ڕێز لە هیچ شتێك ناگرێت و تەنها مەبەستی مانەوەو سەرکەوتنیەتی لە مێژوودا. بەدڵنیاییەوە پیرۆزیەکەی نەما، بەڵام لەسەدەی نۆزدەهەمەوە سەرقاڵی ئەوەیە جێگرەوەیەك بۆ ئایین دابنێت، چونکە واخۆی نیشان ئەدات بابەتێکە بۆ پەرستن. ڕێباوەڕەکانی پێشکەوتن و بیردۆزەکانی هەڵبژاردن کە هاودەمی ئەم پەرستنە بوون، ئایندەی کۆمەڵگایان هێنایە ئاستی دوایین مەرام. ئەو یۆتۆپیا سیاسیانەی لەسەر ئەم ڕێباوەڕانە دروست بوون، لە کۆتاییدا بوونە هۆی هاتنی چاخێکی زێڕین کە هەر لەسەرەتاوە هەموو پرۆژەیەکیان حەڵاڵ کرد. کۆمەڵگا بەوە ڕاهاتوە شەرعیەت بە هەر شتێك بدات کە لە خزمەتی ئایندەیدایە، هەر بۆیە بەوەش ڕاهات کە مەزنترین سزا بە شێوازێکی ڕەها بەکاربێنێت. ئیتر لێرەوە هەر شتێك لەدژی پرۆژەکەی و ئایدۆلۆژیا کاتیەکەی بوایە بە تاوان و پێشێلکردنی پیرۆزیەکانی دەزانی. بە واتایەکی تر، ئەو جەلادەی کە جاران قەشە بوو لەلای کلێسا ئێستا فەرمانبەرە لەلای حکومەت. دەرئەنجامی هەموو ئەمانە شتێکمان بۆ ڕوون بۆیەوە، ئەویش ئەوەیە: کۆمەڵگای ئەم نیوەی سەدەیە مافی دەرکردنی سزای لەسێدارەدانی بەپێی لۆژیکێکی ڕاست

و ڕەوان لەدەستداوە، ئێستاش لەبەر چەند هۆکارێك کە پەیوەستن بە واقیعی ئێستامانەوە، پێویستە لەسەری ئەم سزایە لابەرێت.
شارستانیەتی ئێمە چۆن بتوانێت بەرامبەر بە تاوان هەڵوێستی خۆی یەکلاکاتەوە؟ وەڵامەکە ئاسانە: ئەوا سی ساڵە تاوانەکانی دەوڵەت لە تاوانی تاکەکان زۆر زۆر زیاترن. من مەبەستم جەنگە گشتی و ناوخۆیەکان نییە، ئەو کەسانەی دەوڵەت ڕاستەوخۆ دەیانکوژێت ڕێژەکەیان خەیاڵییە، ئەمڕۆکە ڕێژەیان لە ڕێژەی تاوانە تایبەتەکان زۆرترە. ژمارەی سزادراوە ئاساییەکان لە کەمبوونەوەدایە، ئەمە لەکاتێکدایە ژمارەی سزادراوە سیاسیەکان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەکات. بەڵگەش لەسەر ئەوە، هەر یەك لە ئێمە، چەندە بەڕێزیش بین، ئێستاکە دەتوانین چاوەڕوانی ئەوە بکەین ڕۆژێك دێت و دەکوژرێین، لەکاتێکدا گریمانەکردنێکی لەمشێوە لەسەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا شتێکی پێکەنیناوی بوو. نوکتەکەی (ئالفۆنس کار)[29] کە دەیوت: "با بکوژە بەڕێزەکان دەست پێبکەن" چیتر هیچ واتایەکی نەماوە. ئێستا گەورەترین خوێنڕێژانی سەردەم ئەوانەن کە پێیانوایە ڕەوایەتی و لۆژیك و مێژوو لەگەڵیاندایە.

---

[29] نووسەرێکی فەرەنسییە، لە (١٨٠٨-١٨٩٠) ژیاوە.

کەواتە ئەمڕۆکە دەبێ کۆمەڵگاکەمان هێندەی خۆی لە تاکەکانی دەپارێزێت دوو هێندە خۆی لە دەوڵەت بپارێزێت. لەم سێ ساڵەدا ڕێژەکان پێچەوانە بوونەتەوە، ئەمڕۆ دەبێ تەنها و تەنها لە دەوڵەت خۆمان بپارێزین. دادپەروەری و پێویستیەکانی واقیع وادەخوازن کە یاسا تاك بپارێزێت لە دەوڵەتێك کە خۆی داوەتە دەستی شێتیی پارتگەرایی و خۆبەزلزانی. ئەمڕۆ دروشمی بەهێزیمان دەبێت ئەمە بێت: "با دەوڵەت بەرپا بێت و سزای مەرگ نەهێڵێت".

دەوترێ یاسای خوێناوی ڕەوشت خوێناوی دەکات. بەڵام ڕەنگە لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا دۆخێکی ئابڕووبەرانە بێتە ئاراوە کە سەرباری هەموو تێکشڵەژانێك، ڕەوشت هێندەی یاساکان خوێناوی نەبن. نیوەی ئەوروپا بەم دۆخە ئاشنان، ئێمەی فەرەنسیش چاك پێی ئاشناین، ئێستاش هەڕەشەی ئەوەمان لەسەرە کە جارێکی تریش پێی ئاشنا بینەوە. ئەوانەی داگیرکەران لەسێدارەی دان کەوتنە بری ئەوانەی پرۆسەی ڕزگاری لەسێدارەی دان، هاوڕێیانی ئەمانی دیش خەون بە تۆڵەسەندنەوەوە دەبینن. لە جێگایەکی تریش هەندێ دەوڵەت خۆیان بۆئەوە ئامادە دەکەن کە تاوانەکانیان نوقمی کوشتارگەی گەورەتر بکەن. ئەوان لەپێناوی گەل یان لەپێناوی چینێکی بەخواکراودا کوشتن ئەنجام دەدەن. ئەوان لەپێناوی

کۆمەڵگەی داهاتوودا کوشتن ئەنجام ئەدەن، کە ئەوانیش دیسان بەخواکراون. هەر لایەنێك پێی وابێ هەموو شتێك دەزانێت پێشی وایە هەموو کارێك دەتوانێت. بتەکانی رۆژگار داوای پەرستنێکی رەهامان لێدەکەن، بێ‌وچان سزای رەها دەردەکەن. ئایین گەلێك کە هیچ پیرۆزییەکیان تیا نییە سزادراوە بێ هیواکان بە کۆمەڵ دەکوژن.

کۆمەڵگای ئەم نیوە سەدەی ئەوروپا چۆن بتوانێت بە زیندویی بمێنێتەوە ئەگەر بڕیار لەسەر ئەوە نەدات بە هەموو ئامرازێك بەرگری لە خەڵك بکات لەدژی داپلۆسکاریەکانی دەوڵەت؟ رێگرتن لە سەپاندنی مەرگ بەسەر خەڵکیدا واتا هاوارکردن و جاڕدانی ئەو راستیەی کە کۆمەڵگاو دەوڵەتیش هیچیان بەهایەکی رەهایان نییە، هەڵماڵینی ئەو راستیەیە کە هیچ شتێك رێگەیان پێ‌نادات یاسای کۆتایی دارێژن و بنەهۆی کارێك کە گەڕانەوە لێی مەحاڵ بێت.

ئەگەر سزای مەرگ نەبوایە رەنگە ئێستا (گابرێل بیێری) و (برازیاك) لەنێوماندا بوونایە. ئەگەر سزای لەسێدارەدان نەبوایە شۆڕشەکەی روسیا نوقمی حەیاچوون نەدەبوو، گەر ئەڵمانیاش نەختێك تاوانی کەمتر بوایە ئەوا لە ئەوروپا نەختێك باشتر پێشوازی لێدەکرا، ئەگەر سزای لەسێدارەدان نەبوایە ئەوا هەنگاونانی خوێنی جەزائیریەکان بەسەر ویژدانمادا هێواشتر دەبوو. ئەگەر سزای لەسێدارەدان نەبوایە،

ئەوروپا بەهۆی ئەو هەموو تەرمە کەڵەکەبووەی نزیکەی بیست ساڵە بەسەر خاکەکەیەوەیە، بۆگەنی نەدەکرد. هەموو شتێك لەم کیشوەرەی ئێمەدا بەبۆنەی ترس ورقی نێوان تاك و نەتەوەکاندا سەراوژێر بوو. ململانێی بیرۆکەکان لەبری گفتوگۆ بە پەت و کارد یەکلادەکرێنەوە. ئەوە کۆمەڵگای مرۆیی نییە کە مافی خۆی لە داپلۆسیندا جێبەجێ دەکات، بەڵکو ئەو ئایدۆلۆژیایە کە مرۆڤەکانی کۆنترۆڵ کردوەو داوای ئەم قوربانیە مرۆییانە دەکات. کەسێك[30] نووسیویەتی: " ئەو پەندەی کە بەردەوام قەنارە بەئێمەی دەبەخشێت ئەوەیە کە ژیانی مرۆڤ چیدی پیرۆزییەکی نامێنێت، وەختێ دەبینین کوشتنی سود دەگەیەنێت". وادیارە ئەم سودە لە زیادبووندایەو ئەم پەندەش تادێ بڵاوە دەکات، پەتاکە بەرەو هەموو لایەك بڵاوەی کردوە، لەگەڵ خۆیشیدا پشێوی نیهلیزم پەرەدەسەنێت. کەواتە دەبێ تا زووە ئەم کارە راگرین و لە گشت پرنسیپ و دامەزراوەکانماندا جاڕی ئەوە بدەین کە خودی مرۆڤ لە سەرو دەوڵەتیشەوەیە. بۆیە هەر ڕێوشوێنێك فشاری هێزە کۆمەڵایەتیەکان بۆ سەر تاك کەمبکاتەوە، هاوکار دەبێت لە رزگارکردنی ئەوروپا لە مەترسی خوێن رشتن، ڕێگەیشی پێدەدات بەشێوەیەکی باشتر بیربکاتەوەو هەنگاو بەرەو

---

[30] فرانکار.

چاکبوونەوە بهاوێ. نەخۆشیەکەی ئەورووپا ئەوەیە بڕوای بە هیچ نییە، خۆیشی وادەردەخات ھەموو شتێك دەزانێت، بەڵام هەموو شتێك نازانێت. وەگەر هەڵسەنگاندن بۆ ئەم یاخیبوون و هیواخوازیەی ئێستامان بکەین، دەگەینە ئەو بڕوایەی کە تەنها باوەڕی بە یەك شت هەیە: باوەڕی بەوە هەیە کە مرۆڤ لە دوا سنوری مەینەتیدا دەگاتە ئەوپەڕی مەزنیی. زۆربەی ئەورووپیەکان باوەڕیان لەدەستدا، هاوکات هەموو ئەو پاساوانەیان لەدەستدا کە بۆ سزایان دەهێنایەوە. ئێستا زۆرینەی ئەورووپیەکان قیزیان لە دەستەواژەی ئەو دەوڵەتەش دەشێوێتەوە کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد جێی ئایین و باوەڕی بۆ خەڵك گرتۆتەوە. ئیتر لێرە بەدوا، کە لە نیوەی ڕێگادایین، هاوکات دڵنیاین و دوودڵیشین، سوورین لەسەر ئەوەی کە نابێ چیتر توندوتیژی و داپڵۆسینمان بەرامبەر ئەنجام بدرێت، لە هەمان کاتیشدا دەبێ ئایندەو نەفامی خۆیشمان بناسین، دەبێ باوەڕی رەها رەتکەینەوە، دەبێ ئەو یاسایەش رەتکەینەوە کە گەڕانەوە لێی مەحاڵە. هێندە تێگەیشتنمان هەیە کە بە تاوانبارێکی گەورە بڵێین ئەمە شایەنی کارپێکردنی قورس و زیندانی هەتاهەتاییە، بەڵام هێندە تێگەیشتنمان نییە کە بێ بەشی بکەین لە ئایندەی، واتە بێبەشی بکەین لە توانای بیرکردنەوە. لابردنی سزای مەرگ پێویستە بکرێتە مادەی یەکەمی

دەستوری ئەوروپا، دەستورێك كە هەموومان ئومێدەوارین لە ئەوروپایەكی ئایندە باشدا ببینینەوە.
ڕێگای چامە مرۆییەكانی سەدەی هەژدەهەم ڕاستەوراست بەرەو قەنارە خوێناویەكان دەڕوات، جەللادەكانی ئەمڕۆش، وەك هەمووماندەزانین، مرۆڤدۆستەكانن. بۆیە مایەی شەرم نییە گەر گومان لە ئایدۆلۆژیای مرۆیی بكەین لەمەڕ كێشەیەكی وەك كێشەی سزای مەگ. ئێستا من كە لە كۆتایی نزیك بوومەتەوە، دەمەوێت ئەوە دووپات بكەمەوە كە نە خەیاڵكردن دەربارەی چاكیی سروشتی مرۆڤ، نە باوەڕهێنان بە هاتنی چەرخێكی نوێی زێڕین، هۆكارن بۆ دژایەتی من بۆ سزای مەرگ، بەڵكو بۆیە لابردنی بە پێویست دەزانم، چونكە بەكارێكی نالۆژیكی و ناراستی دەزانم. هەر كەسێك چەند هەفتەیەك خۆی سەرگەرمی ئەو نووسین و یادگاری و مرۆڤانە بكات كە دورو نزیك پەیوەندیدارن بە قەنارەوە، ناتوانێت لەم ڕێگا دڕكاویە دەرچێت بەو ئاسانیەی هاتە ناوی. بەڵام من لەهەمان كاتدا لەو باوەڕەدا نیم لەم جیهانەدا هیچ بەرپرسیاریەتیەك بوونی نەبێت، پێشموانییە پێویست بكات ملكەچی ئەو ئاراستە نوێیە بین كە داوای بەخشینی هەموو شتێك دەكات، داوای بەخشینی قوربانی و بكوژ دەكات لە یەك هەژاندا. ئەم هەژانە سۆزداریە پەتیە هێندەی لەسەر

ترسنۆکی پێی گرتوە هێندە لەسەر بەزەیی پێی دانەکوتیوە، لە کۆتایشدا پاساو بۆ هەموو خراپەکارییەکی ئەم جیهانە دەهێنێتەوە. وەگەر پیرۆزیشی بخەینە پاڵ، ئەوا پیرۆزی دەخەینە پاڵ سەربازگەی بەندەکان و هێزی ستەمکارو جەللادە ڕێکخراوەکان و قەڵخانی دڕەندە سیاسیە گەورەکان، لە کۆتایشدا براکانمان ئەدەین بەدەستەوە، ئەم کارەشیان لەم چواردەورە دیتراوە. بەڵام مرۆڤی سەردەم، لەم دۆخەی ئێستای جیهاندا، داوای یاساو دامەزراوەی بوژانەوە دەکات کە بتوانێت جڵەویکات بێئەوەی تێکیبشکێنێت. مرۆڤی سەردەم لەمیانی هەنگاونانی لەم دینامیکیە مێژووییەی کە ناتوانرێت جڵەوگیر بکرێت، پێویستی بە فیزیاو ژمارەیەك یاسای هاوسەنگی هەیە. بە کورتی پێویستی بە کۆمەڵگای ژیری هەیە نەك بەم پشێویەی کە بەهۆی خۆبەزلزانی و دەسەڵاتە بێسنورەکانی دەوڵەتەوە خۆی تێناوە.

من لەو باوەڕەدام لابردنی سزای مەرگ یارمەتیمان ئەدات لەوەی کۆمەڵگامان لەم ڕێگایەدا پێشبخەین. ئەوجا فەرەنسا، گەر ئەم کارە بکات، دەتوانێت پێشنیاز بۆ هەموو ئەو وڵاتانەی تر لە هەردوو دووی دیوارە ئاسنینەکە بکات، کە هێشتا سزای مەرگیان هەڵنەوەشاندۆتەوە. بەڵام دەبێ پێش هەموو شتێك خۆی ببێت بە

نمونە. ئەوکاتیش دەتوانرێت لەبری سزای مەرگ سزای کارپێکردنی هەتاهەتایی بەسەر ئەو تاوانبارانەدا جێبەجێ بکرێت کە چیدی کەڵکی چاکسازیان نەماوە، ئەوانی تریش دەکرێ بە سزای کارپێکردنی کاتی سزابدرێن. هەر کەسێکیش پێیوابێت ئەم سزایە لە سزای لەسێدارەدان توندترە، ئەوا بەسەرسامییەوە وەڵامی دەدەینەوە کە بۆچی پێشنیازی نەکردوە ئەو جۆرە سزایە هەڵگرین بۆ هاوشێوەکانی (لاندرو)[31]، تا سزای مەرگیشمان بەسەر تاوانبارە مامناوەندیەکاندا جێبەجێکردایە. ئەوەشی وەبیردەخەینەوە کە کارپێکردنی قورس بژاردەی مەرگیش بۆ سزادراو دەخاتە بەردەست، لەکاتێکدا قەنارە هیچ ڕێگایەك بۆ گەڕانەوە ناهێڵێتەوە. هەر کەسێکیش بەپێچەوانەوە پێیوابێت سزای کارپێکردنی قورس سزایەکی ئاسانە، ئەوا یەکەم شت پێی دەڵێین بەڕێزتان خەیاڵتان کورتە، دواتریش پێی دەڵێین وادیارە لێ زەوتکردنی ئازادی بەلاتەوە سزایەکی سوکە لەچاو ئەو ڕقەی لە کۆمەڵگاوە فێریبوویت بەرامبەر بە ئازادی[32].

---

(31) لاندرو: تاوانبارێکە بە تاوانە قێزەونەکانی فەرەنسای هەژاند. قوربانیەکانیشی ئافرەت بوون. ژنانی بە خۆشەویستی دەخلەتاند، پاشان دەیکوشتن، دواتریش لە کوورەی ئاگردا دەیسوتاندن. ساڵی ١٩٢٢ لەسێدارەدرا. (وەرگێڕی عەرەبی)

(32) ئەمەی خوارەوە ڕاپۆرتی بەڕێز (دیبۆن)ـە کە نوێنەرە لە ئەنجومەنی نیشتمانی، ڕاپۆرتەکە هی ٣١ ئایاری ١٧٩١ دەربارەی سزای مەرگ: "خوویەکی تیژی سوتێنەر ناخی بکوژ دەخوات، زۆرترین شت کە لێی دەترسێت وچانە. ئەمەش دۆخێکە لەگەڵ خۆی دەیهێڵێتەوە، هەر وەختێ بیەوێ لێی دەرچێت

لە راستیدا قابیل کەسی نەکوشت، کەچی بەدرێژایی سەدان ساڵە مرۆڤەکان بە لالووتیەوە لێی دەڕوانن، هەرچۆنێك بێت، ئەمە ئەو نمونەیە کە پێویستە لە سەردەمی کۆنەوە وەریگرین، هەڵبەتە دەبێ ئینجیلەکانی لێ بەدەرکەین، نەك بچین نمونە خراپەکانی شەریعەتی مۆسایی وەرگرین. بەهەرحاڵ، رەنگە باشتر وابێت وڵاتەکەمان ئەزمونێکی ماوە دیاریکراو تاقیبکاتەوە (بۆنمونە دە ساڵ بخایەنێت)، ئەگەر هێشتا پەرلەمان ناتوانێت بیر لەوە بکاتەوە لەبری دەرچاندنی یاسا لەبەرژەوەندی بەرهەمهێنانی مەی، بیر لەوە بکاتەوە کە کارێکی شارستانی گەورە بکات وەك قەدەغەکردنی یەکجارەکی سزای مەرگ. وەگەر رای گشتی و نوێنەرانیان بە راستی ناتوانن دەستبەرداری ئەم یاسا تەمبەڵە بن کە لەبەر ئەوەی ناتوانێت کەس چاکساز بکات خەریکی ملپەڕاندنی تاوانبارانە، ئەوا با لانیکەم، بەدەم چاوەڕوانی هەڵهاتنی خۆری ژیانی جددی و راستەقینەوە، هەوڵبدەین لەم "کەولگە فەرمیە"ـی کۆمەڵگەمانی پیسکردوە رزگارمان بێت. سزای مەرگ وەك ئەوەی ئێستا جێبەجێ دەکرێت،

---

هەولی کوشتن دەدات. گۆشەگیری و ویژدانی بوونەتە ئازاری راستەقینەی. ئایا ئەم کەسە خۆی جۆری ئەو سزایەمان نیشان نادات کە دەبێ بەسەریدا بسەپێت؟ خۆی رێمانیشان ئەدات کە بە چ جۆرە سزایەك هەستیارە، ئایا نابێت لە سروشتی نەخۆشیەکەی ئەو دەرمانە وەرگرین کە چارەسەری دەکات؟". ئەم رستەی دوایی وا دەکات لەم نوێنەرە کەم ناوبانگە ببێتە رێنیشاندەرێکی راستەقینە بۆ زانا دەروونناسەکەی ئەم سەردەمە.

تەنانەت ئەگەر کەمتریش جێبەجێ بکرێت، کوشتارگەیەکی قێزەونە، سوکایەتیە بە خودی مرۆڤ و بە لەشی. ئەم مل پەڕاندنە، ئەم سەرە زیندوە بڕاوە، دیمەنی ئەو فوارە خوێنینە دوورودرێژە، مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی دڕندەی دەشتەکی کە ئەوکات لەو باوەڕەدابوون ئەم دیمەنە ئابڕووبەرانە کاریگەری بۆ سەر گەل دەبێت. ئێستاش کە ئەم شێوازە ئاست نزمە لە کوشتن جێبەجێ دەکرێت، ئیدی چ مانایەك بۆ ئەم ئازارە ماوەتەوە؟ ئێمە لەسەردەمی ئەتۆمدا هەمان ئامرازی کوشتنی سەردەمی قەپان بەکاردێنین. هیچ مرۆڤێکی سروشتی نییە کە بەتەنها بیرکردنەوە لەم نەشتەرگەریە نابارە تووشی ڕشانەوە نەیەت. وەگەر دەوڵەتی فەرەنسا ناتوانێت لەم گۆڕەپانەدا بەسەر خۆیدا سەرکەوێت و یەکێك لەو دەرمانانە پێشکەش بە ئەوروپا بکات کە خۆی پێویستی پێیەتی، ئەوا با لانیکەم دەستبکات بە چاککردنەوەو گۆڕینی شێوازی جێبەجێکردنی سزای مەرگ. ئەو زانستەی کە کەڵکی لێوەردەگیرێت بۆ کوشتن بێگومان دەتوانرێت کەڵکی ئەوەشی لێوەرگیرێت کە چۆن بتوانرێت بەشێوازێکی ئابڕومەندانە خەڵك بکوژرێت. بەنجێك هەیە کە سزادراو لە دۆخی خەوەوە دەگوازێتەوە بۆ دۆخی مردن، دەتوانرێت ئەم بەنجە لەسەر سزادراوان بەکاربهێنرێت و لانیکەم ڕۆژێکی پێ‌بدرێت کە بتوانێت

خۆی ئازادانە بەکاری بێنێت، ئەگەر رازی نەبوو یان نەیتوانی خۆی بەکاری بێنێت ئەوا ئەوکات دەکرێت بە رێگایەکی تر لەسەری بەکاربهێنرێت. بەنجێکی وەها مردنی سزادراو مسۆگەر دەکات، لەهەمان کاتدا نەختێك ئابرِو دەگێرِیتەوە بۆ پرۆسەکە، کە لەئێستادا نمایشێکی زۆر قیزەون و ئابروبەرە.

من ئاماژە بەم چارەسەرە مامناوەندیانە دەکەم بە ئەندازەیەك کە پێویست دەکات هەندێجار نائومێد بین کاتێ دەبینین دانایی و شارستانیەت خۆیان بەسەر ئەو کەسانەدا دەسەپێنن کە بەرپرسن لە ئایندەمان. ئاشنابوون بە کرۆکی سزای مەرگ و نەبوونی توانا بۆ رێگرتن لە جێبەجێکردنی، شتێکە کە هەندێ مرۆڤ ناتوانن بەرگەی بگرن. ژمارەی ئەو کەسانەش زۆر لەوە زیاترە کە بیری لێدەکرێتەوە، ئەوانیش بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەم سزایە دەچێژن. با لانیکەم تیژرِەوی ئەم وێنە قیزەونانە خاوبکەینەوە کە سزادراوان لەژێریدا پەکیان دەکەوێت، ئەوکات کۆمەڵگە هیچ شتێك نادۆرِێنێت. بەڵام لە کۆتاییدا هەر ئەم خاوکردنەوە بەس نییە، چونکە ئاشتی هەمیشەیی نە لە دڵی تاکەکاندا و نە لە رەوشتی کۆمەڵگادا بەرقەرار نابێت، ئەگەر مەرگ نەخرێتە دەرەوەی یاساوە.

... کۆتایی ...

